# نووسەری کورد

## گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کورد

ژمـارە (٨) ، خولی دووەم حوزەیرانی ١٩٨٢


سەرۆکی نووسین

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

سکرتێری نووسین

مومتاز حەیدەری



بارەگای گۆڤار

بغـداد ـ الوزيريـة

مقـابل كلية التربية الرياضيـة ـ مقر جمعية الثقافة الكردية

چاپخانەی «الحوادث»

# « الكاتب الكردي »

مجلة « نووسەری کورد »

## مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

العـدد (٨) ، الدورة الثانيـة ، حزيـران ١٩٨٢

رئيس التحريـر

الدكتـور عزالدين مصطفى رسـول

سكرتـير التحرير

ممتـاز الحيدري

الادارة

بغـداد ـ الوزيريـة

مقـابل كلية التربية الرياضيـة

مقر جمعية الثقافة الكردية

# THE KURDISH WRITER

BULLETIN OF
THE UNION OF THE KURDISH WRITERS IN IRAQ

No. ( 8 ) Second Period, June 1982

EDITOR - IN - CHIEF :
Proffesor - Ds. C. : IZZADIN MUSTAFA RASOOL

DEPUTY EDITOR - IN - CHIEF :
MUMTAZ HAYDARI

Office : BAGHDAD, WAZEERIYYAH, OPPOSITE COLLEGE OF PHYSICAL EDUCATION, HEADQUARTERS OF THE KURDISH CULTURAL SOCIETY.

# ئەم ژمارەیەش

وا ئەم ژمارەیەش دەچێتە پاڵ ژمارەکانی‌تری نووسەری کورد •
ۆ سروشت‌و جۆرو ڕێبازو بارو کات‌و شوێنی دەرچوونی ئەم ژمارەیە ،
شتێکی تازەمان نی‌یە ، لەو قسانەی زیاد بکەین کە لە چەند ژمارەی
پێشوودا نووسیمانن •

لە کاتی دەرچوونی ژمارەی پێشوودا بوو ، چەند مانگێك لە وولات
دوور بووم ، بە نامەیەك هەواڵی یەکێتی‌ی نووسەران‌و گۆڤاری
« نووسەری کورد »و هەندێك شتی‌ترم لە برای جێگری سەرۆکی یەکێتی
پرسیبوو ، لە وەڵامدا نووسیبووی :

« ئەگەر یاسای گۆڕین لە ژیاندا ڕێگام بدات ، دەڵێم ـ هەموو
شت لەجێی خۆیەتی » •

بێگومان لە چوارچێوەی گشتی‌ی ژیاندا یاسای گۆڕین ڕێگامان
نادات بڵێین لە ژیاندا ، لە کۆمەڵدا هیچ نەگۆڕراوە ، چونکە ژیان‌و
کۆمەڵ لە چوارچێوەی بەرینی خۆیاندا هەر لە گۆڕین‌و بەرەوپێش
چووندان • ئەگەر هەندێك جار بە ڕەواڵەت بەرەو دووا هاتن ببینین، ئەوا
ئەوەش لە بزووتنەوەی حەلەزۆنی‌ی ژیاندا هەر هێڵی چوونە پێشەوەیان

گرتووە ، بزووتنەوەی ژیانو کۆمەڵیش هەندێك جار هێندە سستە کە بە ڕەواڵەت هەستی پێناکرێت ، بەڵام کە تنۆك تنۆك ئاو کۆ دەبێتەوە دەبێت بە دەریا ، یا گردبوونەوەی قورسایی گۆڕینی چۆنێتیی لە دووایە •

با لەم باری سەرنجی فەلسەفییەوە کە بە ڕاستو بە جێی باوەڕی دادەنێین ، بێینەوە سەر ئەو بە ڕەواڵەت نەگۆڕانەی باری یەکێتیی نووسەرانی کوردو گۆڤاری « نووسەری کورد » •

**لە ژمارەی پێشوودا نووسیمان :**

« ئەوە سێ ژمارەشە هەر کردوومانە بە عادەت کە باسێکی باری مانو نەمانی یەکێتیی نووسەرانی کورد بکەین • سەیر ئەوەیە کە هەرچی لە دوو ژمارەی پێشوودا دەربارەی باری یەکێتیو بێدەرامەتیو یارمەتی نەدانو چاوەڕێ بوونی هەڵوەشاندنەوە یا مانەوە نووسرا ، ئێستاش هەر وایە ، ئەمەش جێ پەنجەی بە هەموو باری دوواکەوتنو دەرنەچوونی گۆڤارەکەوە بەجێهێشتووە • • »

ئەمە لە ژمارەی پێشوودا نووسرا ، کەواتە وا بوو بە چوار ژمارە ئێمە هەر ئەو باسە دەڵێینەوەو هیچ شتێك نەگۆڕاوە • ئەوە نەبێ کە لە ڕووی دەرامەتەوە ، ڕەنگە دووا فلسی پارەی یەکێتی بدەین بە کرێی چاپی ئەم ژمارەیەو لەسەر ساجی عەلی لێی دانیشین • چونکە بە داخەوە هیچ یەکێك لە ژمارەکانی « نووسەری کورد » بە تەواوی نەفرۆشراوەو بەشی ئەوەمان دەست نەکەوتۆتەوە کە بتوانین ژمارەیەکی تری پێ چاپ بکەینەوە :

هەرچی ئەم ژمارەیەشە ، ئەوا وەك لە ژمارەی پێشوودا نووسرا :
« هەموو سروشتی ژمارەکانی پێشوو لێرەدا دووبارە دەبێتەوە :
دوواکەوتنی ژمارە ، گرانیی نرخی ، بێ توانایی گەیشتنە قاڵبی ڕەنگینی تەکنیکی جوانی چاپکردن » •

بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا سروشتی ڕۆژنامەگەریی کوردی هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا ، لە پاڵ ئەوەدا کە دەنگ‌و ئاوێنەی گەل بووەو زۆرتر هەر چەکی تێکۆشان بووە • هەر لە خۆشیدا تێکۆشەرانە دڕی بە کۆسپ‌و تەنگوچەڵەمە داوەو ئەم گۆڤار جێی ئەوی گرتۆتەوەو کەرەسەی پەنگەوە خواردووی دەروونی نووسەران ، لە ڕێی قەڵەمەوە کەوتۆتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤار •

وا ئێمەش ، خۆمان بە میراتگری ئەو مێژووە دەزانین ، تا لە تواناماندا بێت ، بەم جۆرەش بێت ، هەر هەوڵی نەمراندنی گۆڤارەکە دەدەین • هەرچی ناوەڕۆکی گۆڤارەکەشە ، ئەوە لە زووەوە قاڵبی خۆی گرتووە ، تێکڕا کەرەسەی ئەدەبی‌و سەر بە ئەدەبیات بڵاودەکاتەوە • هەر لەبەر سروشتی گۆڤارەکە خۆی لەلایەك‌و لەبەر نەزانینی کاتی دەرچوونی گۆڤار ، خۆمان لە هەندێك باس‌و بەرهەمی ڕۆژانەو سەر بە ڕۆژ بە دوور دەگرین • چونکە زۆر جار بووە ، کە گۆڤارێکی وەك ئەمەی ئێمە کەرەسەی سەر بەم مانگەو ڕووداوەکانی‌ی بڵاوکردۆتەوە ، بەڵام چەند مانگێك دوواکەوتنی چاپ هەر کەرەسەو گۆڤارەکەشی وا لێ‌کردووە کە لای لێ‌نەکرێتەوە •

کەرەسەکانی ئەم ژمارەیەش ، هەر بەردەوامی ژمارەکانی ترن • نامانەوێ ڕێ لە هیچ نووسەرێك بگرین • دەمانەوێ ، بەو چەشنە بیرکردنەوەو بەو جۆرە ڕوخسارو بابەتەی نووسەر خۆی بە ڕێی

خزمەتی گەلی دەزانێو گەلیش پێی تووڕەو وەڕس نابێت ڕێگەی نووسینو بڵاوکردنەوە بە هەموو نووسەرەکانمان بدەینو وەك یەکێتیی نووسەرانی کورد موڵکی هەموو نووسەرانو خاوەنانی چەند ڕێبازو پلەی ئەدەبی‌یە ، گۆڤارەکەش هەر بەو جۆرە بێت •

**( سەر نووسەر )**

# پێداچوونەک لسەر مامکێت کوردی

**کۆمکرن و بەرهڤکرنا**
**ئەحمەد عەبدوڵلا زەرو**

**مامك یان مەتەڵۆك :**

دەما ئەم دبێژین « کورد و فولکلور » هزار بابەتێن نە نڤیسی لسەر زارێ پیرو کالا ، سترانبێژا ، زەری‌و لاوا ؛ دەما دگێڕان‌و نهو دبێژن ، تێتە هزرو بیرا • لەوا دبینم ، دەم دخازیت تۆڕبێ مە پڕ کری مست ـ مست ڤالابکین‌و ژ وەڕا داقوتین‌و بەلاڤکەین ، چونکە ئەو کۆگ نەمان ، جارەکا دی ڕونین‌و ڤەگێرین ل شەڤ بێری‌یا ، زڤستانا ، تاڤە هەیڤێن شەڤ هاڤینا •

کورد دبێژن : مامکێ منو ••• منو ! ؟

ئانکو : تشتێ منو ••• تشتو ! ؟ ئانکو : مامێ منو ••• مامۆ !؟ ، ئەڤە دەست پێ‌کرنەکا ڤێ لایێ فولکلوری‌یە ، دەما قیزو لاو ، یان جڤاتا ماڵێ دڕۆنن‌و ژیەك‌و دوو ڕا چیروك‌و چیڤانۆکا ، بەندو ئاخفتنێت خوەش دهاڤێنە بەر ئێك •• ئەڤجا مە بابەت مامکەو دەسپێکرنا مە گوتی ، کورد گەلەك پەیڤا بکار تینن ، یا بەلاڤ ئەوە ( مەتەلۆك ) ٥ (١) ئانکو مەسەلۆك ب هەردوو شێوەیا ، دشێوەیا ( لۆڕی ) پێ دبێژن ( چەوچە ) (٢) و دکرمانجیا کوردێن سوڤیەتدا دبێژنێ ( تێ‌دەرخستنۆك ) (٣) ••••

( مامك ) ژكویڤه هاتیه ؟ ئاشكرایه ژ پەیڤا ( مام ) و پاشپرتا ( ك ) ژبو خوشكۆكـكرنا پەیڤێ دگوهێ لاوێ كوردا یان ڤیزا خوشتڤی ، چونكـه یا خۆیایه مامكێت كوردی ژسازكرنو ڤەهاندنا كالێ كوردە ژ مێرو ژناو ژ بچوكێن خوەڕا دگوتن وەك هـەر بابەتەكێ فولكلـوری •• ئەڤجـا ئاخفتنا مە ( مامێ منۆ ) كو ل دیفرا گوتنەك هەیە ! كی دزانیت چی‌یە؟••

**مامك چی‌یە ؟**

مامك یـان مەتـەلۆك جـۆرە ئاخفتنـەكە ، لێكـدای‌و سـەرف پەخشانەكا بسەروا تێت ، یان سەر ف شعرا كوردی ڤە دچیت هەر چەندە دبینین جاران ب كێم‌و كاسی‌یە دكێشا خوەدا ، لێ دئەنجامـدا « ئاخفتنەكـا لێكدایە » دڤەهاندنا خوەدا •

مامك دئەدەبێ فولكلوری‌دا هندە جارا وەك ترانا ، هنـدە جارا بێ مەبەس‌و بو چاخ برنەو تێكدانا مەژیێ مروڤە (٤) ، هندەك جاران بـو مەبەستا تایبەتی ف ژیانێ‌ڤە هەیە وەك ترانا ( هزلیـات ) و پشـكێن دی یێن فولكلوری كو دبیتە ئەگەرێ هەوڵدانا كومەڵایەتی‌و سیاسی (٥)••• هەر وەسا دبینین ئەڤ جۆرە بابەتە دبەلاڤن دناڤ كوردەواری‌دا ژبـەر نەبوونا بێ‌هویكرنا مژویل بوونێ ، ژبەر ڤێ چەنـدێ ئەڤ مەتەلۆكـە دەرخسـتن ژئەگەرێ موكومكرنا هزرو بیرێت مروڤێ خـۆرت‌و لاوو پڕكرنا ڤالایەكی ژژینا وان گەنجا (٦) ، پترتر ژئەگەرێ نەبوونا جهێت خواندنێ‌و نڤیسینێ دنێڤ گوندێن كوردستانێ‌دا ••

**مامك چەند جۆرەیە ؟**

مامك دوو جۆرەیە ( پشكە ) ؛ مەتەلی مەبەسدار و مەتەلێن بـو تێكدانا مەژی‌یە ، هەردوو پشك كویراتی و تێبینی‌و ، ژیری‌و هشیاری‌یا

کویر بەرێ خۆدانا نەتەوەیێ مە دیاردکەت ••• بەرێ خۆدانا هەمی تشتەکێ ل چارکنارێ خۆ و هەمی ڕویدانێت ژیانێ (٧) •••

**مامکو سوود ژێ چی‌یە ؟!**

مامك دکوردی‌دا وەك پشکێن دی ژ مەتەلێن زمانێن دی (بیانی) ، دەستەکێ درێژ هەیە دپاراستنا هندەك زاراڤ و گوتنێن تایبەتی دزمانێ کوردی‌دا ، بەلکو گەلەك جاران دداڕێتنا مامکی دا لڕەخ‌بیرێن کویردا جوانیا پەیکەرو ڤەهینانا گوتنێ ژی دبینین (٨) •••

هژمارا مامکێن بەلاڤکری ب هەمی زارێن کوردی‌ڤە تنێ من ئەڤ کۆمەلە پێش چاڤێ و حەز دکم ژ خوێندەڤانا مە ئەگەهدارکەن ژێن مە نەگوتی ب سوپاسی‌ڤە •

١ ـ دپشکا دوماهی ژ کتێبا حاجی جندی ( فولکلورێ کوردی ) (٤٠٠) مامك بەلاڤکرینە (٩) •

٢ ـ دیسا دپشکا دوماهی ژکتێبا پروفیسور قەناتی کوردوئیف ( کومەلە تێکستی فولکلوری کوردی ) (٦١) مامك بەلاڤـکرینە ـ لاپـەرە ٢٦٨ •

٣ ـ دگوڤارا ڕۆژی کوردستان ژمارە ٦٣ تموز اب سالا ١٩٨١ ماموستا حەمە مولا کەریم بەلاڤکری‌یە ، لاپەڕە ٣٤ ب کوردی و هژمارا وان ( ٩٧) مامکن •••

٤ ـ ئەڤ کومەلە مامکێن من بەلاڤکرین ژدەڤـەرا بـەهدینـان لناڤبەرا زاخو و دهوك و ئامێدی و ناوچا بەرواری‌یانن •••

هەر وەك مە گوتی مامکا بەرێ ژین و ژیێدا مللەتێ کوردی خۆیا دکە ، ئەڤجا گەر بێن و شروڤەیەکی بدەینە چەند نموونەیەکا وەسا دبینین کارو بارو سروشت و ئامویرەتێن کوردەواری و پیشەیێن ڤی وەلاتی دبنە بابەت و ب وێنەیا مامکا ڤە و تیژی یا هزرو بیرێن خۆرت و زەریا کورد دلڤین و ئەندازەیا تێگەهشتنا وان حەندە !؟

بڤی ئاوایی ڤەهینەرێ مامکا شارەزاهیەکی توند دیار دکە ژلایەکی جوانکاری و ڕەوانبێژی ڤە ، چەوا دبینین چاخێ دبێژن :

« دەه برانە ، هەر دەه تێنە دەشتێ

هەر ئێکێ فرشەکێ ل پشتێ »

مەبەست ( تلن – پەنجن )

گرێدانا – تلا ب برایانڤە – فەرش و نەینوك – ، و نێزیکیا کارو مەبەستان دۆێنێن خوەدا کارەکی هۆنەری و ئەدەبی مینا شعرا کوردی هەر چەندە دبڕ ێن خوە کێم و کاسی هەیە ، لێ دسەروادا – دەشتێ – ئێکن .

## ( شەڤبێژێن کوردەواری )

شەڤ زەنگلە ، هێشتا ڕوهنیا کارەبایێ تیرێژین خۆ نەدابینە کولان و دەرێت تاخێ مە ، بەرسفك و دۆشکێن دمالا پڕن – پڕ ژگەنج و خۆرتا ، زەری و شۆخا ، ب هەڤڕا ڕونشتینە یاریا دکن ، هنەك سەرهاتیا دگێڕن ، هنەك گوتنا ، چەندەك پێنجوکانێ (١٠) دکن ، لێ چەندەکا مامك ژخوەڕا دگێڕان هشیاری و زیرەکیا خۆ بەرچاڤ

دکرن •• لڤێره دلێ من خواست ئەڤ کوگه و چەوا مامکا دهاڤێنه بەر ئێك •• سەرگێرێ جڤاتێ کورگەهـ گێرا و گوتی :

ئیرو شەڤا مامکانه ، ئەمێ ب رێزێدا هێن و هەر ئێك مامکەکێ بەرهەڤکەت و باڤێته بەر جڤاتێ •••

سەرگێری کورگەهـ ڤەکرو گوت :

مامکێ منۆ ••• منۆ !

« پیرەکا دڕێ دا

هزار کەلەم دڕێکێ دا » چی‌یە ؟

بەرسڤ وەك هەر جار ، هزرکرنەکا دژوار و کویر و بەرسڤ و وەلامێ ددن و دبێژن [ کەرەنگە ـ کەنگرە ] •• بڤی ئاوایی سەدەها مامك وەکی مە بهیستی و کۆمکری دێ ژوەڕا رێزکەین ب دلخوشی، چاخەکێ خوەش ببنە سەر ، دڤەگێرنەکا کوردەواری و بێ ڕێزکرن •

**نموونە بو مامکێن کوردی**

١ ـ مەلایێ ب لنگەکێ
چوو شەڕێ گوندەکێ

× « تەڤرە ـ قەزمەیە »

٢ ـ هەنوونێ مەنونێ
یا خوارە وەکی داسکا درونێ
هەچ یێ نەزانیت
گونێ مامێ د قونێ

× [ هەیڤە ـ مانگە ]

٣ ـ بەرەك ل سەر بەرەكێ
تەيرەك دخوينيت ل دۆلەكێ
كونا قونێ ل نيڤەكێ
✕[ دستارە ]

٤ ـ تشتێ منۆ تشتەكە
يێ ب كولاڤ و دەرسۆكە
ناڤێ وێ زڕ چەپۆكە
✕[ كێچـە ]

٥ ـ گلڤنكى ئاڤدەن
گۆلك مەزن دبيت
✕ [ كولند ـ كولەكەيە ]

٦ ـ بابێ تە ڕوينشتە ديوانێ
گونێت وى چوونە كولانێ
✕ [ كولند ـ كولەكەيە ]

٧ ـ يێ مرى
مروڤى ب گريا بەرددەت
✕ [ پيڤازە ـ پيوازە ـ پيازە ]

٨ ـ يێ مرى
يێ ساخ دەهەلگريت
✕ [ لاندكە ـ بێشكە ]

٩ ـ يێ مرى
مروڤى هەر دكەتە ئاڤارى
✕ [ دەست نڤێژا ستويرە ]

١٠- مامکێ منو
یێ ل دیف ته دزڤریت
✕ [ دوخینه ]

١١- یێ مری
خوینێ ژ مروڤی دهینیت
✕ [ ستری‌یه ، درکه ]

١٢- یێت د مروڤی دنیت
پێنج شاهدن
✕ [ تلن - پەنجەکانن ]

١٣- هەمی دونیا دچیتێ
لێ ده ستکەکێ کایێ ناچیتێ
✕ [ گوهن - گوێچکەکانن ]

١٤- ب پێت خۆ دچمه مالێت خەلکێ
ب پێت خەلکێ دچمه مالا خۆ
✕ [ مرۆڤێ مری‌یه - کەسی مردوو ]

١٥- قەسرا خودێ چێکری
بەنیا کون تێڤەکری
✕ [ کولنده - کۆلەکەیه ]

١٦- تەنویرا زمزمی
تژی تێ نانێ گەنمی
ـــ ئانکو دبێژن !

١٧ـ تەنویرا دمدمی
تژی نانێ گەنمی
سحارێ ڕابین خەتمی
مەبەست [ ئاسمان و ستێرن ]

١٨ـ قورئانا دنــێ
هەفت مەلا هاتنێ
نەهاتە خواندنێ
× [ کڤارکە ]

١٩ـ سەرڤە هەسان
ژبنڤە قورئـــان
× [ دۆمبەلان ]

٢٠ـ گولکێ مەلای
زلەك نەهێلا سەرێ چیای
× [ شالۆکە ـ داسۆلکە ]

٢١ـ وی لای پەژان (١١)
وی لای پەژان
ل نیڤەکێ موری‌و مەرجان
× [ چاڤ ـ چاو ]

٢٢ـ مێهڤانێ مالێ دچیتە مالێ
دەرگەهی ناگریت
× [ دوو مێهڤانن ، ئێك ڤەدکە و یێ دی دگریت ] •

٢٣ـ تشتێ منۆ تشته
نەبەرە (١٢) نە پشته
× [ نیسکە ]

٢٤ـ دارا ل ناڤ دارا
زەر دکەت گوهارا
× [ گوهیشکە ]

٢٥ـ کەرو کایێ دکەم بەرو
هێدی هێدی دبێمێ (١٣) وەرو
× [ باگۆردانە ـ باگۆڕە ]

٢٦ـ پڕ تانـە
هەچیێ نەزانیت حەیوانە
× [ پرە ـ پڕدە ]

٢٧ـ ڕێزا کارا دانای
تژی دانێ قوتای
× [ ڕەختە ]

٢٨ـ دیکلێ مەتێ
کەفتە خەتێ
کەس نەگەهشتێ
× [ گوللەیە ]

٢٩ـ مامکێ منۆ ••• منۆ
دونیا هەمی ل سەر نکلی (١٤) ئاڤایە
× [ خامەیە ـ پێنوسە ]

٣٠ـ هەفسەد و ئێك
ل بن لحێفکەکێ دنڤن
× [ هەفسەد : ناڤێ ژنکێ‌یەو (ئێك) : مێرکە ]

٣١ـ کەر زڕی
کوشپل فڕی
× [ تفەنگە ]

٣٢ـ چوومە دۆلەکا ب خڕە بەر
من داپیرا تە گرت
باپیرێ من خۆ هاڤێتە سەر
× [ نێری و بزنن ]

٣٣ـ سندریکا ل سەر سندریکێ
کلیلکا ددەستێ بویکێ
× [ دستارە ]

٣٤ـ لاوێ ئەڵمانا
دگەڕهیت ل کولانا
ڤون تیژترە ژ ددانا
× [ دوپشکە ـ دۆپشك ]

٣٥ـ مامکێ منۆ ... منۆ
شیرینێ شارێ
هنگڤینێ دارێ
گوهـ بەلێ ب ڕێدا
پێ پالەی ب دیفدا
× [ کەرەو بارێ تری و خودان ]

٣٦ـ هرڤه دارو وێڤه دار
یێ دناڤێدا سەیێ هار
✕ [ جوهنی‌یه ]

٣٧ـ هرڤه بەرو وێڤه بەر
یێ د ناڤێدا میر عوممەر
✕ [ جوهنی‌یه ]

٣٨ـ چوومه سەر بانه‌کێ
من بەرێ خۆ دا ئاقاره‌کێ
حەفت بەقێت ددەڤێ ماره‌کێ
✕ [ ملهێبه ] (١٥)

٣٩ـ ژهنگڤینی شیرینتره
ژ پساسی گرانتره
✕ [ خەوە ـ نووستن ] ە

٤٠ـ ماهینا مەلای
بەردا چیای
زلەك نەهێلای
✕ [ گویزانه ]

٤١ـ سەرڤه هەلامەت
بنڤه قیامەت
ب تەڕی دبەمێ
ب هشکی دئینم
(ص) عەلا ( محمد)
✕ [ تەنویره ]

٤٢ـ سەر ئاخوینە
بن دارینە
خوارنا وی گیایێ شینە
× [ قەلوینە ]

٤٣ـ مێرگا شین
تژی هەلاَلو بەیبوین
× [ ئاسمانە ]

٤٤ـ بازنێ ستی‌یێ
هاڤێت کانی‌یێ
شەفەق دا ئامێری‌یێ
× [ هەیڤە ـ مانگە ]

٤٥ـ ل ئاڤێ ددن تەڕ نابیت
ل بەری ددن کەر نابیت « لەبەرد دەدرێ ناشکێتەوە »
× [ سیتاڤکە ]

٤٦ـ سەرڤە هەستی ( ئیسقان )
بنڤە پەڕاسی
× [ بانە ـ بانیژە ]

٤٧ـ شمعینێ دوو قوین ، هەڕە سەربانی ببین
× [ باگوردانە ]

٤٩ـەلێ ـ ق (١٦) ـ ب ڕها هلاویستی
× [ دەرگەهـ ـ دەرگا ]

٥٠- مامكێ منۆ ••• منۆ
بن دارێ سەر ئاسن
كەرۆ ••• درێژكە
× [ درێشكە ]

٥١- مامكێ منۆ •••
قوين ل ئاخێ
سەر ل قوينێ
دەڤ ل دووا
× [ بێری چاخێ بزنێ ددۆشیت ]

٥٢- مامكێ منۆ ••
پسمیرێ ب شەپكەكێ
× [ دێندكا برنجیيە ] [ داتەی برنجە ]

٥٣- لاوێ زەر
يێ دقەسرا سپیدا
× [ هێكە ـ هێلكە ]

٥٤- هندی دبەزيت
ژجهێ خۆ ناچیت
× [ ئاشە ]

٥٥- سنگێ دكەڤری قوتای
جوتەكێ گلولا ڤێدا بەردای
× [ ئامويرەتێ مروڤە ـ ك ]

٥٦ـ هینی‌و مینی
پێ ل بەر گوینی
ئەزێ دبینم
تو نابینی

× [ چاڤن ـ چاون ]

٥٧ـ ل دوور تە دزڤریت
لێ تە ناگێت

× [ دۆخینە ]

٥٨ـ پرا دارینی
کۆچا ئاخینی
خوەرێ وێ
گیایێ شینی

× [ قەلوینە ]

٥٩ـ مەتەلۆكو مەتی‌تە
پورپسێ کەتنە عیرێ‌تە ( زگی‌تو )

× [ ئیپراخن ]

٦٠ـ تەپەك لسەر تەپەكێ
تێدا مارێ گەزەكێ
سەردا کونێت ڕوڤیا
دسەرداتر چرایێ نەبی‌یا

× [ ڕویچك ـ ڕوومەت ]

٦١ـ مامكێ منۆ •••
سێ مەلا ب شاشکەکێ
ـ ئانكو دبێژن :
سێ برا ب شاشکەکێ
✕ [ خانك ـ خوان ]

٦٢ـ مامكێ منۆ •••
سێ تشت هەنە دل ئێش
✕ [ زڕنابێژو مریشكو مێش ]

٦٣ـ شرینۆك ل دارینۆك
دارینۆك ل گوهبەللۆك
گوهبەللۆك ب ڕێ کەت
پێ پەحنۆك ب دیف کەت
✕ [ تریێ دسەڵکادا ، سەڵك پێ لپشتا کەری ، خۆدان
ژی پێ ب دیفڤە ]

٦٤ـ سەرڤە حەلان
بنڤە قورئان

✕ [ حاجیلۆك ـ حاجی ڕەشك ـ باڵندەیەکە ]

٦٥ـ مامكێ منۆ •••
کشتو مشت
چوو وێراهە ڕوونشت
✕ [ گیسکە ، جەریفکە ]

٦٦ـ تلمسكا ترى
خانى تژى كرى
× [ چرايه ، فه‌نه‌ره ]

٦٧ـ ئه‌گه‌ر بباره (١٧) چوار پيانه
ئه‌گه‌ر بێ باره ب شه‌ش پيانه
× [ كێزه ، كێزكه ]

٦٨ـ مامكێ منۆ ...
خانيێ بێ ده‌رى
× [ هێكه ـ هێلكه ]

٦٩ـ تژى شكه‌فته‌كێ
هه‌سپێت ئه‌نى چالن
× [ ستێنگن ]

٧٠ـ هه‌ل هه‌له
سمێل به‌له
وێ دگه‌ڕيت
لسه‌ر تاقێت كوده‌لا
× [ پشيكه ـ كتكه ]

٧١ـ گلولكا ده‌زى
ب به‌ته‌نێ ( هه‌ورازى ) ڤه به‌زى
× [ سويسكه ]

٧٢ـ مامكێ منۆ ...
كوڕ ژ بابێ مه‌ستره
× [ هێستره ]

٧٣ـ گرێکا بزمارا
وا ل پشت مالا
بو جارو بارا
× [ هناره ـ ئەناره ]

٧٤ـ عەجێبا من ئەو عەجێبە
مەهینا من شەش ڕکێیە
کوریا ب پشتێڤە ـ پشتێڤە ـ
× [ تەرازی‌یە ـ تەرازوو ]

٧٥ـ سەر مشارو
بێ خەپارو
× [ کەلەشێره ]

٧٦ـ سەر گل گلە
بن گل گلە
چاڤ زیق‌و
سمبیل بەلە
× [ کێڤریشکە ـ کێوریشك ]

٧٧ـ چوومە شکەفتەکا تاری
تژی تێدا مراری ( مرواری )
× [ ددانن ـ دانە ]

٧٨ـ پاتە بێ سەر
پشتە بێ زك
دەستە بێ بێ
× [ کۆملەکە ـ کراسە ]

٧٩- چووم شکەفتەکێ
تڕی بزنێت ب شاخەکێ
× [ مێویژن ]

٨٠- ژ بەفرێ سپی تره
ژ خوونێ سۆر تره
ژ قیڕێ ڕەش تره
× [ لەگلەگە - حاجی لەگلەگ ]

٨١- سیق‌و سیق
هەشت لنگ‌و
دوو پیق (١٨)
× [ جووتیاره ]

٨٢- مامێ من ب لنگەکێ
همبەری گوندەکێ
× [ دەرگەهە - دەرگا ]

٨٣- هێسترا وان ل بێدەرۆ
نه دز دبن
نه گۆر (١٩) دخۆن
× [ مێرییه - مێرووله ]

٨٤- زەره زەره
زەحفەرانه
نقیسی‌یه نه قورئانه
× [ زێـره ]

٨٥- بنێقه شینه
ل بازارا ڕەشه
ل مالێ سۆره

× [ توڤچایه - توقێ چایه ]

٨٦- گایێ سۆر
دگەلیدا گرێدا

× [ ئەزمانه ]

٨٧- مالێ منۆ ...
هەرۆ دەیکاته
هندێ داتکەت

× [ دوودا دەری ]

٨٨- چوومه ئۆدا ژێری
من دیت ژنا سەر مێری
م گوتێ دێ چ کەی حورمەتێ ! ؟
گوتی دێ ڤی مێری ئینمه نێری

× [ دستاره ]

٨٩- هەرۆ دەیکاته
کۆمەکا هێکا دکەت

× [ گرێکێت هەڤیری‌نه ]

٩٠- هم همێ
دیوار ســمێ

× [ گەنمه ]

٩١ـ مامکێ منۆ •••
دسەر تەڕا
دبن کەری ڕا
[ گەنمە ] ×

**پەراوێزەکان :**

(١) بحث ودراسة عن الفولكلور الكردي / محمد توفيق وردي/ل ٢ يان ( مەتەل ) ل ٢١٠ ، لێکولینەوەی ئەدەبی فولکلوری کوردی • د• عزالدين مصطفى رسول ، چاپی دووەم ١٩٧٩ •

(٢) نماذج من التراث الشعبي الكردي / محمد توفيق وردي / ل ٦١

(٣) کومەڵە تێکستی فولکلوری کوردي / قەنانی کوردوئیف / ل ٢٦٨ هەر وەسا کتێبا حاجیێ جندی دپشکا دوماهی (فولکلوریێ کوردی) ئەو پەیڤە هاتیە ( ل ٢٢ بحث ودراسة عن الفلكلور الكردي ) محمد توفيق وردي •

(٤) لێکولینەوەی ئەدەبی فولکلوری کوردی / د• عزالدين مصطفى ل ٢١٠ •

(٥) هەمان سەرچاوە ل ٢١١ •

(٦) نماذج من التراث الشعبي الكردي / محمد توفيق وردي ل ٦١ •

(٧) لێکولینەوەی ئەدەبی فولکلوری کوردی / د• عز الدين مصطفى ل ٢١١ •

(٨) هەمان سەرچاوە •

(٩) بحث ودراسة عن الفولكلور الكردي / محمد توفيق ووردي ل ٢٢

(١٠) جۆرە یاریێکی کوردەواری‌یە ، تایبەتی بەکچی کورد بەستراوە •

(١١) پەرژانە ـ پەژان ـ تان •

(١٢) نەبەرە ؛ مەبەست نە ڕوویە •

(١٣) دبێمێ : دبێژمێ ـ پێی دەڵێم •

(١٤) نکل : دەنۆك •

(١٥) ملهێب : شەنەبا •

(١٦) ( ق ) مەبەست ووشەی ( قەشەیە ) •

(١٧) بارە ـ مەبەست ئەوە ( بەبارە ) و نە لە ووشەی ( بارین ) هانووە •

١٨ پیق ـ ڕانـە •

(١٩) گۆر ـ گۆرگ •

# زمانـەوانی

سەر بەرزی بۆ ئەو سەرئامەدانەی دەستیان دایە لێکۆڵینەوەو دەرخستنی کانو جوانیو یاساکانی زمانی کورد • چونکە ئەو کارە هەر ئەوە نەبوو کە بێتە کۆڵەکەیەك بۆ پاراستنو ڕاگرتنی زمانەکەمان • بەڵکو بوو بە سەرقافڵە بۆ ڕێڕەوو نەوەستانی کاروان •

وا ئێستاش زمانەوانی بەشێکی گرنگ لە کۆششی زاناو خۆ پێوە خەریك کەرانی بۆ تەرخانکراوە ، بە دەگمەن گۆڤاری کوردی دەبینی، چەند لاپەڕەی بۆ زمانەوانی تەرخان نەکردبێت• پسپۆڕو زمانەوانی ســەر بەزانسـتیی تـازەی کـورد ، لـە زانســتگاکانی ئەوروپاوە هاتوونــەوەو هــەندێکیـان کۆششــی سەرکەوتووانەیان پێشکەش کرد • لە ناو نووسەرانی خۆشماندا هەندێك بە کەرەستە خۆماڵــیو خودڕەستەکــەوە بەرهەمیان دەبینرێ •••

ڕەنگە زۆر سەرنج بەرامبەر بە هەردوو ڕیزە زماوانەکانو ئەم بەرهەمو ئەو بەرهەم هەبێت ، بەڵام ئێمە لامان وایە هــەر موناقەشەیەك دەربارەی باسەکان خۆیان بکرێن ، هەنگاوێکن بەرەو تەواو کردنی قۆناغو گەیشتنە مەنزڵ •••

هەر لەبەر ئەمە وا نووسەری کوردیش خۆی لــەو مەیدانە دوور ناخاتەوە •

**نووسەری کورد**

# فۆنیمەکانی زمانی کوردی

دوکتۆر وریا عومەر ئەمین
بەشی کوردی ـ کۆلێجی پەروەردە ـ زانستگای بەغدا

زانینی دەنگەکانی زمانو لەیەکدانیـان بۆ دروسـت کردنی بڕگـە بەشێکی زانیاریی قسەکەرە دەربارەی زمانی خۆی • گرنگترین لایەن لە زانینی زمانێ زانینی ئـەو سیسـتەمە تایبەتی‌یەیـە کە دەنگ‌و مانا لەیـەك ئەبەسـتێ • گەر زمانێکی بێگانـە ببیسـتی هیچی لێ تێنـاگەیت‌و نازانێت ووشەکانی لە کوێ‌وە دەست پێ‌ئەکەن‌و لە کوێ تەواو ئەبن • چونکە ئەو سیسـتەمە تایبـەتی‌یە نازانیت کـە دەنگەکانی ئەم زمانـە لە ماناکانی‌یـەوە ئەبەستێ • واتا لە هەر زمانێکا ریزە دەنگێکی تایبەتی مانایـەکی تایبـەتی ئەبەخشێت ، گۆڕینێ بەسەر ئەم ریزە دەنگـە بێ ماناشـس ئەگۆڕێ • بـۆ نموونە دوو ریزە دەنگی ( بەهار ) و ( گوڵ ) لە زمانی کوردیـدا مانایان جیایە چونکە دەنگەکانیان وەك یەك نین (١) • ئەم دوو ووشەیە دەنگەکانیان بە تەواوی جیان • جووتە ووشەی وا هەیە هەندێ لە دەنگەکانیان یەکن‌و هەندێ جیان وەك لە ( هاوین ] و ( هـەویر ) دا ، ( هـ ) ، ( و ) و ( ی ) یەکن‌و ئەوانیتر جیان • جووتە ووشەی واش هەیە تەنها لە تاکـە دەنگێ نەبێ هەموو یەکن وەك لە ( پیر ) و ( بیر ) دا • لەم ووشانەی دواییدا ئەبینین گۆڕینی تاکە دەنگێ مانای تەواوی ووشـەکانی گۆڕی • ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کـە (پ) و (ب) لە زمانـی کوردی‌یا دوو نرخـی جیایان هەیە • بەم جۆرە (پ) و (ب) دوو فۆنیمی جیان لە زمانـــی

کوردی‌یا • له (که‌ر) و (که‌ڕ) یا (برین) و (بڕین)دا (ر) و (ڕ) دوو فۆنیمی جیان چونکه ده‌رکه‌وتنیان له هه‌مان بیئه‌دا

مانای جیای به‌خشی به ووشه‌کانا • ئه‌و ووشانه‌ی هه‌موو ده‌نگه‌کانیان وه‌ك یه‌کن ته‌نیا له تاکه ده‌نگێ نه‌بێ و ئه‌م جیایی‌یه له‌م تاکه ده‌نگه مانای جیای به ووشه‌کانا به‌خشی ( جووتۆکه )ن

به به‌راوورد کردنی جووتۆکانه فۆنیمه کانی زمان ده‌س نیشان ئه‌کرێت •

له ئه‌نجامی گه‌ڕان به شوێن هه‌موو ئه‌و ووشانه ـ بابڵێین ـ له گه‌ڵ (پیر) و (بیر)ا رێك ئه‌که‌ون ، له زمانی کوردیدا ئه‌م حه‌وت ووشانه‌ی خواره‌وه ده‌س ئه‌که‌ون ( به‌پێی کۆشش خۆم ) •

بیر – پیر – تیر – شیر – سیر – ژیر – میر

به‌م جۆره توانیمان حه‌وت فۆنیم ( ب ، پ ، ت ، ش ، س ، ژ ، م ) ده‌س نیشان که‌ین • نه‌بوونی ووشه‌ی تر رێك که‌وێ له گه‌ڵ ئه‌م کۆمه‌ڵه ئه‌وه ناگه‌یه‌نێ که فۆنیمه‌کانی زمانی کوردی هه‌ر ئه‌م حه‌وته‌ن • کۆمه‌ڵێکی تری وه‌کوو ئه‌وانه‌ی خواره‌وه به‌راوورد ئه‌کرێن •

که‌ر ـ که‌ڕ ـ که‌و ـ که‌م ـ که‌س ـ که‌ی ـ که‌ل ـ که‌ف ئه‌م هه‌شت ووشانه که هه‌موو وه‌ك یه‌کن ته‌نیا له ده‌نگی دوایی‌یانا نه‌بێ ، هه‌شت فۆنیم ده‌س نیشان ئه‌که‌ن • ( ر ، ڕ ، و ، م ، س ، ی ، ل ، ف ) دوانیان ( س ، م ) له گه‌ڵ کۆمه‌ڵی یه‌که‌ما هاوبه‌شن و شه‌شیان تازه‌ن • ژماره‌ی فۆنیمه‌کان بوو به سیانزه • لیسته‌که‌مان زیاد ئه‌که‌ین به زیاد کردنی کۆمه‌ڵی تری وه‌کو ئه‌وانه‌ی سه‌ره‌وه •• تا ئه‌گه‌ینه ڕاده‌یه‌ك هیچ فۆنیمی تازه نادۆزرێته‌وه ••• وه‌ك ئه‌وه‌ی خواره‌وه •

| جووتۆکە | فۆنیمەکان | فۆنیمی تازە |
| --- | --- | --- |
| بیر• پیر• سیر• شیر• تیر• ژیر• میر• | ب• پ• س• ش• ت• ژ• م• | ب• پ• س• ش• ت• ژ• |
| کەر کەڕ کەو کەم کەس کەی کەل کەف | ر• ڕ• و• م• س• ی• ل• ف• | ر• ڕ• و• ی• ل• ف• |
| پار بار شار کار زار دار هار مار غار | پ• ب• ش• ك• ز• د• ه• م• غ | ك• ز• د• ه• غ• |
| شەو • خەو • کەو • چەو | ش• خ• ك• چ• | خ• چ• |
| خاو • چاو • داو • ناو • ڕاو • لاو | خ• چ• د• ن• ڕ• ل• | ن• |
| ڤیان • ژیان • زیان | ڤ• ژ• ز• | ڤ• |
| حەوت • نەوت • کەوت• خەوت• چەوت | ح• ن• ك• خ• چ• | ح• |
| چـل • چـڵ | ل• ڵ• | ڵ• |
| بەش گەش ڕەش لەش شەش کەش | ب• گ• ڕ• ل• ش• ك• | گ |
| هەزار • هەژار • هەنار | ز• ژ• ن• | — |
| باش • ماش • جاش | ب• م• ج• | ج• |
| هەور • چەور • جەور | ه• چ• ج• | — |
| ڕەق • ڕەش • ڕەپ • ڕەز | ق• ش• پ• ز• | ق• |

| جووتۆکە | فۆنیمەکان | فۆنیمی تازە | ژمار |
|---|---|---|---|
| ماچ مان مار ماف ماش ماڵ ماد•مام••ات | چ• ن• ر• ف• ش• ڵ• د• م• ت | | |
| مازی• ماسی• | س• ز• | | |
| دوور • دار • دەر • | وو• ا• ە• | | |
| شێر • شار • شیر | ێ• ا• ی• | وو• ١ ـ ٥ | |
| زۆر • زار • زوور • | ۆ• ا• وو• | ێ• ی• | |
| ژن • ژین • ژان | ( ا)• ی• ا• | ۆ• | |
| کـۆن • کـون | ۆ• و• | ا• | |
| برین • بڕین | ر• ڕ• | و• | |
| کەڕ• کوڕ• کۆڕ• کڕ | ـە• و• ۆ• ا• | — | |
| بان • باغ • بار • باڕ • باو • باش • | ن• غ• ر• ڕ• و• ش• | — | |
| | | — | |

هەر چەندی کۆمەڵی تر زیاد کەین هیچی تری نوێمان بۆ نادۆزرێتەوە ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە فۆنیمەکانی زمانی کوردی بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە (٣٥) ن •

یەکێ لەو گۆڕینانەی بەسەر سیستەمی فۆنۆلۆجیی شێوەی سلێمانی هاتبێ توانەوەی دەنگی ( د ) یە لە هەندێ بیئەدا • یەکێ لەمانە توانەوەی ( د ) ی ئامرازی هەمیشەیی‌یە •

Daxom ——— Axom

Damxward ——— Amxward

سروشتی ئەلفو بێی عەرەبی ئەم ( ئـ ) یەی بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندووە لە نووسینا •

(دەکەم) ـــ ( ەکەم ) ، ( ە ) بە تەنیا ناشێ بنووسرێو کراوە بە ( ئـە ) •

هەروا دەرنەکەوتنی ( ئـ ) لە هیچ ووشەیێکی کوردیو بوونی بە ( ی ) لەو ووشانەی لە عەرەبی‌یەوە وەرگیراون ئەیسەلمێنێ کە ئەم ( ئـ ) یە نیشانە نی‌یە بۆ هیچ دەنگێو ناشێ بخرێتە سیستەمی فۆنۆلۆجی کوردی‌یەوە •

گەلێ ووشەی عەرەبیشن کە دەنگی (ع)ی تیایە لە زمانی کوردی ئیمڕومان بەکار ئەهێنرین وەك ( لەعنەت ) •

( عیسا ) ، • • هتد ئەشێ ( ع )ش بە فۆنیمێکی کوردی دابنرێت• بەم ـ جۆرە و بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە زمانی کوردی (شێوەی خواروو) (٣٦) فۆنیمی هەیە •

ئاشکرایە کە دەنگی (س) لە ووشەی ( سەر و باس )دا جیان

له دەنگی (س) کە لە ووشەی (ساڵ و سەد )دا دەرئەکەوێ • لەم ووشانەی دوایيدا دەنگەکە وەك بڵێی شێوەی ( ص ) ی وەرگرتبێ

سەرەرای ئەم جیاوازی‌یە هەردووکیان سەر بە یەك فۆنیمن و یەك نرخیان هەیە لە سیستەمی فۆنۆلوجی زمانی کوردیدا • چونکە جووتە ووشەی وا نادۆزرێتەوە لەم زمانە کە ئەم دوو دەنگە جیاوازەی تیا لە هەمان بیئەدا دەرکەوێ‌و دوو مانای جیا ببەخشێ • ئەم دوو دەنگە هەردووك لە زمانی عەرەبیشدا هەن کەچی سەر بە دوو فۆنیمی جیان چونکە دوو نرخی جیایان هەیە لە سیستەمی فۆنۆلوجی‌ی زمانی عەرەبیدا هەردووك لە هەمان بیئەدا دەرئەکەون و مانای جیا ئەبەخشن وەك لە ( ساز ـ ڕۆیشت ) و ( صار ـ بوو ) هەردووك لە بیئەی [ (••••)ار] دەرکەوتن و مانای جیایان بەخشی •

(ر) و (ڕ) لە زمانی کوردیدا دوو فۆنیمی جیان چونکە لەم زمانە جووتە ووشەی وا هەیە ئەم دوو دەنگە جیاوازە تیایانا لە هەمان بیئەدا دەرئەکەون و مانای جیا ئەبەخشن وەك لە (برین) و (بڕین) یا (کەر) و (کەڕ)دا لە بیئەی [ ب ••• ین ] و [ کە••• ] • ئەم دوو دەنگە لە زمانی عەرەبیشا هەن وەك لە ووشەی ( کریم ) و (رب)دا دەرئەکەون ، بەڵام لە سیستەمی فۆنۆلوجی‌ی زمانی عەرەبیدا بە یەك فۆنیم ئەژمێرێ چونکە جووتە ووشەی وا نی‌یە لە زمانی عەرەبیدا کە تەمسیلی چەن دەنگێکی جیا ئەکا لە زمانێکی تایبەتیدا واتا هیچ ووشەیێك لە زمانی عەرەبیدا نی‌یە تیایا بە ئاڵو گۆڕ کردنی ئەم دەنگە مانا بگۆڕێ• ئەم دەنگانە شێوەی جیا ئەگرن بە پێی ئەو بیئە جیاوازانەی تیایانا دەرئەکەون • تیایانا دەرکەوتنی ئەم دوو دەنگە جیاوازە لە هەمان بیئەدا دوو مانای جیا ببەخشێ • واتا فۆنیم شتێکی ( مجرد ) ە

له زانستی زمانا بۆ جیا کردنەوەی ئەم دوو لایەنە نیشانەی فۆنیم ئەخرێتە نێوان دوو هێڵی لارەوەی وەك و نیشای دەنگ ئەخرێتە نێوان دوو کەوانەی وەك [ ] پەیوەندی نێوان دەنگ و فۆنیم لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە •

| | | |
|---|---|---|
| / فۆنیم / | | [ دەنگ ] |
| | | [ دەنگ ] |

وەك

| | | |
|---|---|---|
| / س / | [ س ] | [ لە زمانی کوردیدا ] |
| | [ ص ] | |

ئەلف و بێی هەر زمانێ بە پێی ژمارەی فۆنیمەکانی دەس نیشان ئەکرێن • هەر فۆنیمەی نیشانەیەکی بۆ دائەنرێ کە پێی ئەووترێ ( پیت ) یا ( تیپ )

# دیاردەیەکی زمانەوانی

**رەئووفی ئەحمەد ئالانی**

گۆیندەکانی جارانمان تا ئەنیشمکیان نەخستایەتە سەر مشتووی خەنجەر ، لە حەیرانیان ڕانەدەچریکاند ..!!

منیش لەمێژە خووم بە ئەوەوە گرتووە کە بە شتی خۆشکیلەی کوردەواری ، بابەتە زمانیەکان تەڕاو بدەم ؛ چونکە خوێندەوارەکانمان دەست بەرداری ئەم گوتەیە نابن : « زمانەوانی وشکەرۆیە = رەقەنە .. ! ! »

**لە بیرمە :**

ددانی حەوت ساڵم کەوتبوو .. ئێمەی بنارنشین هەر بە هەوارگەی خۆمانمان دەنازی . پیرە کوڕەیەکمان رەهندەی شاران بوو ... ساڵانەش سیلەی رەحمی بەجێدەهێنا .. وەك شاری یەکان ناسکەلانە قسەی دەکرد .. وەك ئێمە دەم ددانی لە قسان گیر نەدەکردن .. ! !

بەلامانەوە سەیر بوو کە دەی گوت :ـ

« ئیتر خۆم یێم بۆ لاتان .. ئیتر خۆم ئەزانم ... هتد ! ! »

زیـاد لە پێویسـت بێژەی « تر ، ئیتـر » و « ئـە » ی لە بـاتی « ئیدی ، دی » و « دە » ی نیشانەی کار ، بەکاردەهینان ••

تەقڵبازەکانمان ئەوەندەی دیکە ، زێدەیان دەمداو ئەم تەوسـەیان تێ گرت :

« گوایە ژەمێکیان دایکی ، نانو دۆی بۆ دادەنێ ؛ ئەویش لێی زویر دەبێو پێی دەڵێ :ــ ئیتر من نانو ئۆ ناخۆم » •

لە باتی ئەوان گوتەنی بڵێ :ــ

[ ئیدی من نانو دۆی ناخۆم ] ••• ! !

دەشێ ئەو کابرایە وای لە دڵ گەڕابێ کە بـەو جۆرە لاسـایی‌یە ، ئیمتیاز پەیدا دەکاو بە شارستانی حەلێب دەکرێ ••

ئێمەش تەنگەبەرانە حەملابووین ؛ لامان وابوو دەبێ ئـەوەی لـە کۆخەڵەکانی خۆمان لە دایك بوو بێ ، بە مسقاڵ قسەو نەریتی خـۆی نەگۆڕێ •• ! !

لە حاڵی حازردا ئەو ڕووداوە سـاکارە ، لەگەڵ ئێمەی نووسەراندا دەستەو یەخەیە •

زمانی پەسندکراوی نووسینمان ، ئەوا هەیـەو زادەی کاروانێـکی مێژوویی‌یەو بنکەو زەمینەکەشی ئاشکرایە •• ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە بە بێ هەلومەرج هەرچی لە مەڵبەندەکەی سلێمانیدا بگوترێ ، لە ڕووی گرامەرەوە یان زاراوەوە ، کامڵو تەواوەو کوتومت لاسایی بکرێتەوە • لەلایەکی دیکەشەوە کە دەڵێین : دەوڵەمەندکردنی ئەو شێوە گەشەسەندوە، بە هەموو شێوەکانی دیکـە •• مانای ئـەوە نی‌یە بـە بێ بەرنامەیـەکی

زانستانەو پلانێکی ژیرانە ، جەنجاڵو زەبەندی بکەین‌و ببێتـە عەمبـاری پێویست‌و نا پێویست •

لێرەدا دەگەڕێمەوە بۆ گوتارێکم ، کە لە ٢١ ئابی – ٩٧٨ – داو لە ژمارە – ٤٣٨ – ە می ڕۆژنامەی هاوکاریدا بلاوکرایەوە •••

ئەویش بە سەرناوی [ تر – و – دی ] •

دوو شت پاڵی پێوەنام کە زادەی هەمان نووسین بخەمەوە بەرچاو •• وێڕای ئەوەش کە لە گۆڤاردا باشتر دێ بەدەستەوە :–

١– لە یادمە نووسەرێکی بەخێرو بێرمان ، نووسینەکەمی پەسندکردو

لە بەرهەمەکانیدا – پەیڕەوی کرد •• ئەمەش تەکانێکی دڵسۆزانە بوو••• دوواتر لە زۆر بەرهەمی نووسەرە بەرێزەکاندا ، هەمان پەیڕەوم کەوتەوە بەرچاو ، بەم ڕووداوە کۆڵێك دڵخۆش بووم •• !

٢– بە پێچەوانەوە مامەڵەو سـەودایەکی دیکـە دڵ تەزێنی کردم کـە ئەمەیە :–

تا ڕاددەیەك‌و لەم دوایيـەدا ، نووسـەرەکانی سـەر بە سـلێمانی قەناعەتیان بەوە کرد کە ئەرکی بێژەی « تر » و « دی » وەك یەك نی‌یەو لە نووسیندا ، نابێ هیچیان بچروسێن •

کەچی تازە بە تازە لـە نێـو نووسـەرە بەڕێزەکانی کرمـانجی‌ی ژووروو ••• لە هەرێمی موکری‌و سـۆراندا ، لاسـایی میراتـە وەلا نراوەکەی سلێمانیانە دەکرێتەوە ؟ واتە لە باتی بێژەی ( ئیدی ، دیکە ) ی لەمەڕ خۆیان بێژەی ( ئیتر ، تر ) بەکاردەهێنن •• ؟ !

من دڵنیام کە ئەو سەودایەیان لە نیاز پاکی‌یەوەیە ، کە باوەڕبوونیانە بە بنکەی زمانی نووسینمان •• بەڵام زۆرینەمان لە چۆنێتی‌ی خەملاندنی زمانی پەسندکراودا ، بە هەڵەدا چووین ؟ کەواتە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە :

هەندێ ووشەو مۆرفێم بە ناڕەوا دەچروسێنین یان بۆ چەند ئەرکێکی جیاواز ، یەك ووشە بەکاردەهێنین ، لە کاتێکدا کە بۆ هەر ئەرکێك لەوانە ووشەی تایبەتیمان هەیە •

**أ ــ ئامرازی « تــر » :**

لە سەرتاپای زمانی کوردیدا ، بۆ بەراوردی پلەی ئاوەڵنـاو بەکار دەهێنرێ ، وەك :

« جوان ، جوانتر ــ زۆر ، زۆرتر ••• هتد •• »

لە فارسیدا بە « تەر » دەری دەبڕن ، وەك : « خووب ، خووبتەر ــ ئەڤگەن ، ئەڤگەنتــەر ••• » بــە هەمان ئاهــەنگ لە لقی هەورامیشــدا ، بەکاردەبرێ •

کە بۆ پلەی باڵاش بێ ، پاشکۆ = ملحق ــ ی « ین » وەردەگرێو بە یەکسانی لە هەردوو زمانەکەدا ، وەك : « جــوانتر ــ جــوانترین = خووبتەر ــ خووبتەرین » •

هەمان ئامراز ( تر ، ترین ) لەو ئەرکە سەرەکی‌یە بەولاوە ، چی دیکەی بخرێتە پاڵ ، بە لادانێکی ناوچەیی دادەنرێ •

**ب ــ بێژەی « دی » :**

١ــ وەك ئاوەڵکار ، بەگوڕە کە بڵێین : ( جارێکی دی ) درۆ ناکەین •

٢ـ وەك ئاوەڵناویش بەکاردەهێنرێ ، کە بڵێین : ـ پیاوێکی دی ، پیاوێکی دیکە ڕۆیشت ـ •

٣ـ لە بەراییەوە ، زیادەی ( ئـی ) وەردەگرێ ، وەك ( ئیدی وا ناکەم ) ••

٤ـ لە فارسیدا بەرانبەر بە ( دی ) ی ئێمە بێژەی « دیگەر » باوەو هەمان ئەرکی هەیەو لە ئەرکی « تەر » دابڕاوە ، وەك : مەردێ دیگەر ئامەد •

٥ـ لە موکری‌و سۆرانیدا ، شکانەوەی « دی » بە « دیکە » ڕووداوێکی زەقە ، وەك ( جارێکی دیکە ، کیژێکی دیکە ) •
دوور نی‌یە کە سواوەی « دیگەر » بێ •

٦ـ ئەم « دیکە » یە ، بە سووك‌کراوی تەشەنەی کردووەو لە زمانی نووسینماندا ئاشکرایەو تەنها ( •• کە ) ی ماوەتەوە • بە هۆی ( ی ) ئامرازەوە دەگوترێ :ـ جارێکی کە وا ناکەم • بڕوا ناکەم وا زوو دەست بەرداری بین •• ئەگەرچی لەگەڵ ( ی کە ) ی ڕاناوی لێکدەر = اسم موصول ـ دا ئاڵۆزی‌ی پەیدا دەکا ، وەك :ـ ئەوەی کە دام پێت بمدەرەوە ـ •

٧ـ هەمان قاڵبە سواوە ، بە زێدەی « ئی » یەوە بەکاردەهێنرێ ، وەك :ـ ئیکە نازانم چی بکەم ! •

٨ـ لە هەورامیدا بەرانبەر بە ئاوەڵکاری « ئیدی » بێژەی « هەنی » بەکاردەبرێ ، وەك لەم شیعرەی خانادا :
هەنی جە سەوداش ، مەبەر خاتر تەنگ
هەم مگنۆت نەدام ، سەرمدۆ بە سەنگ

ئەنجـام :

لە تازە هەوارگەکەی باباندا ، شێوە گەشەسەندوەکەی سلێمانی ـ بە ناوی دەورو بەرەکە ـ مۆرفێمی « دی » سەری تێداچووەو ئەرکە ئاوەڵناوی و ئاوەڵکاریەکەی چڕاوەتە ئامرازی « تر » ەوە کە لە خۆیدا بۆ بەراوردی پلەی ئاوەڵناوە • هەر چەندە لە ناوچەکەدا ، بەو هاوبەشی یە ، لە قسەدا باوەو بە هەڵە ناژمێردرێ •• بەڵام ـ لە زمانی نووسیندا تووشی دوو زیانی کردوین :

١ـ لادانی « تر » لە ئەرکی سەرەکی خۆی و پاڵدانی ئەرکی ئاوەڵناوێتی و ئاوەڵکارێتی ، سەربارێکی نەگونجاوە بۆ ئامرازو پاشگر •

٢ـ مراندنی ووشەی « دی ، دیکە » کە لە جۆری بزرەناو = اسم مبهم ـ ەو ، ئەرکە تایبەتی یەکەی ئاشکرایە •

ئەوەش « نالی » کە لە تاقە شیعرێکیدا هەریەکەیانی تەرخان کردوە بۆ ئەرکی خۆی :ـ

قەدری من چەندە لە لای دەوڵەتی دنیای دەنی

قەدری ئەو ( کەمتر ) و هەردوو لە غەمی یەکدی غەنی

ئا لەم روانگەیەوە ، دەتوانین زمانی نووسین بخەملێنین و دەوڵەمەندی بکەین •• نەك بە حوکمی لاسایی ڕووت یان جڵە بە ووشەو مۆرفێمی بێ سەبارەتانە ، کەڵەکە بکەین ، بە نموونە چەوێچەمان بەسەر بەسەرێی ( لووت ـ کەپوو ، خودا ـ خولا ، یان لمال ، جەماڵ ، لەمار ، ڕێوی ، ڕێقی •••• نی یەو نی یە •

# ئەم چیرۆکانە ...

پێش بڵاوکردنەوە ، ڕەخنەگرانە ، سەیری ئەم چیرۆکانەمان نەکرد ، بەڵکو ڕۆژنامەنووسانەو نووسەرانە ، نیشانەی بۆ بڵاوکردنەوە شیانمان لای هەموویانەوە دانا ...

ئەم نیشانەیەش بۆ « نووسەری کورد » ، کە دەبێ دەنگ‌و ئاوێنەی ، بیرو پلەو ڕادەی دەربڕینی هەموو نووسەرانی کورد بێت ، دیارە مەزندەی فۆڕم‌و ناوەڕۆك‌و زمان‌و بیری خستۆتەکارو لە چوارچێوە فراوانەکەی یەکێتیی نووسەرانی کوردو گۆڤارەکەیدا جێی بۆ هەمووی کردۆتەوە .

هەر ڕەخنەیەکیش لە ڕووی هونەرو تواناوە یەکێك لەم لایەنانە بگرێتەوەو خۆی لە بریندارکردنی نووسەر بە دوور بگرێت ، ئەوا جێگەی لەسەر لاپەڕەی نووسەری کورد دایە ...

ئەمانە چەند مشتێکن لە خەرمانی چیرۆکی ئێستامان‌و زۆر لایەنی دەردەخەن. چاوەڕێی لێکدانەوەو ڕەخنەین.

**« نووسەری کورد »**

# بەیتی ئاگر

**چیرۆکە شیعر بۆ نەورۆز**

ــــ ساڵ نی‌یە ، پەل‌وپۆی ، درەختی گڕ گرتوو
چراخان لە کەژوو دەربەندا هەڵ‌نەکا •
ساڵ نی‌یە ئەو گڕە چیرۆکێ بۆ عەشقی
کاوەیەك نەنووسێ‌و
بۆ مەرگی زوحاکێ
دۆزەخێ دانەخا •

ساڵ نی‌یە •• ئەو گڕە ماڵ بە ماڵ نەگەڕێ‌و
دەستی یاد بە سەری ،
نەورۆزدا نەهێنێ •

ساڵ نی‌یە •• پشکۆی ئەو •• ئەژدیها کوێر نەکاو ،
تاریکی ڕاونەنێ •

ئەم « بەیت »ی ئاگرە ، پشتاو پشت ،
دەماو دەم هاتووە

هەر جارەی بە ئێسکی ،
کوڕێك‌و کچێکی « ئاسنگەر »

بڵێسەی خۆش بووە
دە ئێستەش گوێ بگرە
بۆ بەیتێك لەم بەیتی دێرینی ئاگرە :

× × ×

سەردەمێك بوو
دنیای تاریك نووتەك
وەك ئەشكەوتی
قووڵو نسرمی بەسام
چۆكی ڕەشی دادابووەسەر :
گوند و شارو
ڕەزو دێبەرو شەقام ••
گوڵە گەنمی چاو بە سەوزیی هەڵكۆڵراو
كوژراوی ناو برسێتیو قاتو قڕ بوو
ماڵی هەژار
لە خەم سیخناخ
كوانووی هەژار
بێ پشكۆو ساردو سڕ بوو
هەر دەستەیەك •• لە دابەستەی ئەستەمووڵ كۆشكیان
پڕو •• ورگیان پڕو ،
بە دەماغ •
ناوماڵیان پۆشتەو پەرداخ •
ئەو سەردەمە •• نەهەنگەكان
نەهەنگی والیو سوڵتان

بەر سەرچاوەو •• بەر ڕووباری ،
ئاوی ژینی کوردستانیان گرتبوو
ژەندرمەکان : مۆتەکەی ترس
سواری سنگ‌و سواری دەنگ‌و ••
دەس بە نێزە سەر شەقام‌و
ناو کۆڵانیان گرتبوو
ئەوەی دەنگی لەبەردەمی
ژەندرمەدا هەڵبڕیایە
ئەوەی لە سەگی سوڵتانیش یاخی‌بوایە
ئەوەی دەستی بۆ خەنجەری ،
بەر پشتێنی ببردایە ••
زوو لە چینی ناو دیواریان گرتبوو •

× × ×

ئەو دەمە ، زستانێ ، شەوێکیان
وەیشوومەو بەفرانبار
زریانی بە لوورە ئاسمانی تاریکی ،
اوول‌ئەداو لە گڤەی پڕتاوی
مێگەلی پەڵە هەور
ئەترساو ڕای ئەکرد
بەرەو ژوور بەرەو خوار
سەری خۆی هەڵ‌ئەگرت •
وژەی نـاو دارستان
ڕێ‌ی‌و بانی چۆڵ‌و هۆڵ

کەناری زێی هەڵچوو
لێشاوی مل گرتوو
بەرەو ناو شیوو دۆڵ
خەرەندی بە هاژەو تووڕە بووی
کەف کردووی بێ‌سەرەوت :
زریکەو هاواری سروشتی
ترساو بوون
ئەو شەوە • « ڕەواندز » :
ژنێکی غەمگین بوو
لە نوێنی شەختەدا نووستبوو
ئەو شەوە •• لە ژووری ماڵێکی
قوڕینی بن‌میچ و گوێسوانە نزمدا
قوتیلکەی بە دووکەڵ ،
تەواو ڕەش •• داگەڕاو ،
ئەسووتاو شەوقێکی زەردباوی
ئەدا لە : ڕوخساری غەمگینی
دووبرا : « پیربال و کاکە لاو »
دوو برای وەرزێری پێستی لەش
وەك بەڕووی ناو ئاگر هەڵقرچاو
دوو برای بەرچاو ڕوون ،
کاغـەز نووس بە حەرفی حوجرەکەی
لای •• مەلا •
دوو برای داخ لە دڵ
بۆ تۆڵەی باوکێکی بە دەستی ،

ژەندرمە تا سێ ڕۆژ ،
لەچەقی مەیداندا
سەرەو خوار •• هەڵواسرو •
ئەو شەوە •• جووت برا
بەڵێنو بڕیاری
دوو کاری زۆر گەورەو ،
سامناکیان بە یەکدا :

× × ×

ـ مانگێکی‌تر ، زستان وەکوو ، پیرەمێردێ
دەمو دانی ئەکەوێتو ••
سەری لە گوێ قەبر ئەلەرزێ
مانگێکی‌تر سەرما ئەمرێ
گوڵی کێویی
بە لاسکی پەنجە سەوزەکەی
بەفر لەسەر خۆی لا ئەداو ،
دوورو نزیك
چاو لە شوانی گوندا ئەگرێ
بەهار دێتو لە دەرگای :
حەوشەمان ئەداو ،
ئەگریو ئەڵێ :
کێ بێ گڕی کوژاوەی چاوەکانی من
هەڵکاتەوەو تا سەر لووتکە دەسم بگرێ ؟ !
کێ بێ نەورۆزی زیندانیم ،

ئازاد بکاو ،
بە دەنگی بەرز
لاوکی سوورم بۆ بڵێ ؟
ئەی گڕی جەژنە سەوزەکەم
بەڵێن ئەدەم من ئەو کەسەم
مانگێکی‌تر لەسەر بانیژەی ماڵەکەم
ئەتکەمەوەو لەبەر چاوی :
ژەندرمەکان
کڵپەت ئەگەیێنمە ئاسمان •
ـ یاخی‌بوونە لە تاریکی‌ی
خەنجەر کالان بەجێ دێڵێ
شەختەی بێ دەنگی‌ی ئەشکێنم
ئەو وەختەی تۆ
ئاگر ئەکەیت بە گڕ شەوا
منیش ئەچم •• بێ‌ترس ئەچم
لەسەر قەدە ئەستوورەکەی
سوورە چناری گۆڕەپان
بە کوێرە خەتی ـ دەس خەتم ـ
بە گەورەیی تاوی ـ کاوە ـ و
وێنەی چەکوشەکەی دەستی
ئەنەخشێنم
دەورو بەری سوورە چنار
وەك ڕۆژ ڕووناك ئەکەمەوە
بە هاواری کاوەو نەورۆز

ئەم سەر هەتا ئەو سەری شار
ئەخرۆشێنم •

× × ×

ئەو مانگە تێپەڕیو زستان مرد
دووبرای دەروون پڕ
لەسەر تێز چاوەڕوان
گفتاریان شەقاوی هەڵهێنا :
بۆ بڕیار ئەنجامدان •
ئەو ساتەی •• زەردە پەڕ ،
لە هەوری مەیلەو ئاڵ
کەژاوەی ئێوارەی بۆ جوانیی
کرد بە ماڵ •
ئەو ساتەی ناو باخو بێشەڵان
بە دوا تیشك ،
سەرلقو گەڵایان هەزاران ڕەنگی گرت
ئەو ساتەی •• ئاوێنەی ڕووباری
لە دوور دیار
بریقەی بە شەوقی ڕێك ئەیدا
لە چاوی بن‌بنار
ئەو ساتە •• کاکە لاو
لە حەوشەو لە هەیوان
لە چیلکەو چەوێڵو بڕەدار چی هەبوو ،
بە باوەش سەری خست بۆ سەربان

لیژنەدار لەسەریەك
ئەوەندەی باڵای خۆی
کۆمەڵ بوو ••
بۆ ئاگر تێبەردان بنەوەی پووشوو بوو
لەسەر چۆك دانیشتو ،
پزیزکی « بەردەستێ »
پووشووی گرت
تەنێوە •• تەنێوە •• تا سەرێ
بڵێسەی بە لرفەو بە شڵاو
چناری ئاگر بوو
تا ئەهات بەرەو ژوور ،
هەڵ ئەچوو •
خرۆشا ناو شاروو ••
هەر ، سەربوو •
لە دەرگاو پەنجەرەی ماڵەوە ••
هاتنەدەر •• دەنگە دەنگ
چی ڕویدا ؟ چی قەوما ؟
شڵەقا گۆمی مەنگ
وەك لاو لاو
ئاگری نەورۆزی کاکەلاو
لە شاردا دۆست نەما سەرنجی ،
لە باڵای نەئاڵێ
وەك پشکۆش
دڵێکی ڕەش نەما

بە چزەی ئازاری ،
تا سەر ئێسك کون کەری ،
تل نەداو نەناڵێ •

× × ×

لەولاش پیرباڵ وەك سمۆرە
بە قەدی لووسی چناردا هەڵگەڕابوو
لەسەر لقێکی دوو فاقە هەڵکورمابوو
بە کوێرە خەتی ـ حوجرەی کۆن ـ
بە حەرفی گەورەی خواروخێچ
نووسی‌ی : کاوە
نووسی‌ی : نەورۆز
لە پاڵیدا وێنەی چەکوشێکی کێشا
بە دیمەن ئێجگار ناقۆڵا
بۆ کوێرە خەت بوو بە ئاڵا ••
کە هاتە خوار •• ئەمیش لەسەر :
سەکۆ گەورەکەی گۆرەپان
بەرامبەری باڵەخانەی تەختە بەندی
جێ گرەکەی والی‌و سوڵتان
داروباری کۆکردەوە
ئاگرێکی وەك ئاگرەکەی
کاکەلاوی لێ‌کردەوە
کاتێ بەدەم کزەی باوە
کە شەوقی ئاڵی کڵپەدار

ئەیدا لە باڵای بزورگی سوورە چنار
ناوی نەورۆز •• ناوی کاوە
وەك مانگی ناو پەڵە هەور
جارە ناجار ••
ون ئەبوون و دەرئەکەوتن
بەسەر پەیژەی بڵێسەدا
بۆ کوشتنی تاریکە شەو سەرئەکەوتن •

× × ×

شار ڕاچڵەکی
کۆڵان •• کۆڵان •• گەڕەك •• گەڕەك
دەرگای حەوشەی خڕ داخراو
کەوتنە سەرپشت
هاتنە دەرێ وردو درشت
وەك گۆمی مەنگ
خەڵکێکی زۆری حەپەساو
لە دەوری ماڵی کاکەلاو
لە دەوری سوورە چنارو ،
سەکۆی گەورە
ئەڵقەیان بەست •• خڕبوونەوە
چاوێکیان کرد بە چوار چاوو
ورد بوونەوە ••
هەر سەربوو ئەنرا بەسەری
تەنیشتەوە ••

چرپەی پەنا گوێی نەهێنیی
سەر سوڕهێنەر
لەم پەڕەوە هەتا ئەو پەڕ
یەکە •• یەکە •• ئەڕۆیشتو ••
ئەگەیشتەوە ••
دوو ئاگرەکەی
جووتە برا
لە ژووری دڵی تاریکی
ئەو خەڵکەدا
بوون بە چرا

× × ×

ئەم هەواڵە گڕ گرتووە
وەختێ فڕیو خۆی کرد بە ناو
سەراو قشڵەی ژەندرمەدا •
ڕاڕەوو داڵانی تاق ، تاق •••
دوورو درێژ
پێکدا ئەهات •• جمەی ئەهات
تەقەی پاژنەی خێرای پۆستاڵ ،
بن بزمار ڕێژ
جیرە جیری دەرگای ژوورو
قرەقرە •• کۆکە کۆکو ••
بانگ کردنو « جنێودانی »
کوردیو تورکیو ••
شڵەژانو سەرسمدانو ژاوە ژاویان

لە گێژەنی ترس و بیمدا
بۆ خوێنڕشتن
پەنگی ڕقیان ئەخواردەوە

× × ×

لە بنەبانی دالانی سەرەوەشدا
لە ژوورێکی فراوانی بنمیچ بەرزی ؟
پڕ قەنەفەو پڕ فەرشدا
لەسەر کورسیەکی کەتەی ،
پاڵپشت و دەسك نەرمدا ..
ڕوو لە پەنجەرەی بە پەردەی ،
ئەتڵەسی سەوز داپۆشراو
نزیك کوورەی ناو دیواری
بەحاڵ گڕ لە پشکۆ هەستاو ..
جێگرەکەی والی و سوڵتان
پەپاغ لەسەر
برۆ پڕی .. لچ ئەستووری ..
دان ئاڵتوونی .. ڕوخسار ترشاو ..
دانیشتبوو .
لە ناوەڕاستی ژووریشدا
سەرەك ژەندرمەی ورگ زل
چوارپەل قەوی .. کەللە بەران
ڕاوەستابوو ..
نقەو هەناسەی لە سنگی ،

خۆی بڕیبوو
گوێی بۆ فەرمانی سەرکردەی
دەم کەف کردوو
ڕاگرتبوو :
— تۆ پێم بڵێ لە کەیەوە
بۆرە پیاوی ئەم شارە
وایان لێ‌هات لە فەرمانی
« بابی عالی » یاخی بن ؟ !
چۆن توانیان .. چۆن ئەوێرن
وا بێ‌باك ..
دەست بۆ مشتوی
خەنجەری تۆڵە بەرن ؟
ئەی ئێوە چین ..
بەردن .. دارن ..
بتن .. کەرن .. بارگیرن ؟!
ئەوەتا وا ئاگرپەرست
نەوەی شەیتان .. دز .. جەردە
بە ئاشکرا بەر دەروازەو ،
ڕێی سەرامان پێ ئەگرن !
ئاگرو دووکەڵ ئەکەن بە گژ
پەڕەو حەرفی قورئاندا
شیر هەڵ ئەبڕن
لە ڕووی پایەو ..
تەختو بەختی سوڵتاندا !

گوێم لێبگرە ! تا چوار مێخەی
ئاگر پەرست نەکێشن
من نامەوێ جارێکی تر
دوورو نزیك بمبینن ! !

× × ×

هەر ئەو شەوە ژەندرمەکان
وەکوو کوللە ، وەك واشە
دوو دوو .. سێ سێ
دەس بە سوونگی ، بە پرتاو
رژانە ناو گۆرەپانو سەر شەقام
رێگەی پردوو باخو چەمو
دەوری شارو قوتکەی بەرزو
یاڵیان گرت ..
هەر ئەو شەوە .. هێشتا گڕی
ئاگرەکەی جووت برا
لە سەربانو گۆرەپاندا ئەسووتا
کە گەیشتن فێ گرتوانە ،
شێتو هـار
بە پێلەقە .. بە سەتڵەئاو ..
گڕی ئاگرو .. بڵێسەیان
تەواو دامرکاندەوە ..
بەدەم نووکە شەقی قینو ..
بوغزو .. جنێودانەوە

پەرش‌و بڵاو ..
سەرە بزوتك .. کەڵە پشکۆ
لەجێی کڵپە .. دووکەڵی ڕەش
پێچاو پێـچ . !
سەری خەم‌و نوشوستی خۆی
هەڵ ئەگرت ..
دەنگ‌و باسی دوو ئاگرەکەو
جووت برای
بۆ هەوری سەر ئاسۆی دوورو
بە هەواری کۆچەرەکان ..
ئەگەیاند
هەر ئەو شەوە .. لە پشتەوە
باڵی جووت برا ..بەستران
بە دەم زرمەی شەق‌و دۆنکی‌و ..
تێـلاوە ..
لەش خوێناویی بۆ زیندانی ،
شەوە زەنگ بران .
بە فرمانی پەیاغ لەسەر
جاڕی ئەدا :
ماڵی پیربال‌و کاکەلاو لەگەڵ ئەرزا تەخت کرا .
شوێنەواریان کرد بە کولانە بۆ سەگ‌و
توولەو تانجی ماڵی پاشا
هەر ئەو شەوە .. بەتەورداس
کەوتنە وێزەی سوورە چنار

لە ڕەگەوە دەریان کێشا
لەت لەتیان کرد
کۆمەڵ .. کۆمەڵ
بە شان بردیــان
بۆ دارەڕای تەویلەی نوێی
قشڵەو سەرا
هەر ئەو شەوە درەنگانێ
بە فرمانی پەپاغ لەسەر
جارچی پەپو هاتەوە دەر
ئەمجارەیان جارێکی‌دا
چزەو کسپەی لە دەروونی
عاشقانی ئاگر هەستان
کە ئەیقیڕان :
جووتە برا ..
لە دار دران !

× × ×

بەیانی کە شاری گریاوی
قڕ ئاڵۆز ..
ئەستێرکی خوێنینی ..
چاوانی هەڵهێنا
دوو سەری ،
بڕڕاوی خۆی بینی .
بەیانی کە هەتاو ڕێی کەوتە

ناو شارو
چووه سەر سەکۆکەی گۆڕەپان
لە ناکاو کەوت بەسەر ،
دوو لاشەی عاشقی پرشنگیاو ،
زۆر گریا !
ئەوەتا وا ئیستە
بە دەرگای سەراوە
پیربالّو کاکەلاو
دوو جەستەو دوو لاشەی
ساردوسڕ چون بەفرن
بەلاّم بۆ جەژنەکەی دلّداران
دوو گیانی سەوزنو
دوو هەلّۆی ئاگرن •
ئەوەتا وا ئیستە شەمالّێ هەلّیکرد
بە پەنجە ئەسپایی
کاکۆلّیان لا ئەداو ••
تەویّلّیان ماچ ئەکا
ئەوەتا بە چرپە بۆ گەلاّی درەختو
بۆ مەلو بۆ شەپۆل
مەرگی سوور باس ئەکا
ئەڕواتو سەر ئەکا بە هۆبەی
ڕەوەندا ••
ئاگریان خۆش ئەکاو هەوالّی
شارەکەی دوو برای ،

نەورۆزیان پێ ئەڵێ ••
ئەڕواتو جار جارە چناری
ڕای ئەگرێ ••
شەماڵەو ئەم بۆنی کاکۆڵی ،
ئەوانی لێوە دێ
ئەوەتا وا ئیستە هەورێکی
زۆر چڕی هێناوە
ئەم هەورە •• لە دوور ڕا
هاتووەو ماندووە ••
ئەم هەورە •• گینگڵی
ژانێکی بە تاوە ••
ئەم هەورە •• لە گڕی ئاگرەکەی
جووتبرا •• کەوتەوە
لەو •• ساوە
هاتوەو بۆ دواجار برایان ببینێ
هاتوەو بۆ دواجار دەمی عەشق ،
بنێتە ناو دەمیان
ئەوەتا وا شوانی نوقم بووی ،
تا ئەژنۆ لە گیادا
بەرەو ژووور ئەڕواتو
قۆڵ کردوو بە قەفی
گۆچانی سەر شاندا ••
هەنگاوی خەماویی
وەردی تەڕ ئەشێلێ

ئەو ئەڕواو پەڵکە گیای بەرباران ،
لاسك جیڕ ، دێتەوە شوێنی خۆی ،
بێ ئەوەی نیشانەی ڕێگەیەك جێبێڵێ •
ئەوەتا ورد ئەڕواو
گۆرانیی بارانە بۆ کۆچی سوور ئەڵێ :
« باران بارانە ، هۆرەی بارانە
هۆرە بۆ کۆچی سووری یارانە
باران بارانە شەستە بارانە
چاوی ئەو کەژە زنەی گریانە
باران بارانە ڕیز بەڕیزە
ئەوەتا چاومان وا لە ئازیزە
باران بارانە نەرمە بارانە
کۆچی بێوادەی سووری یارانە »

× × ×

ڕۆژ هاتو چوو
کارەساتی جەژنی کوژران
سیمای پیربالو کاکەلاو
ون نە ئەبوون لە خەیاڵداو ••
جێیان نەهێشت سۆمایی چاو
لەناو ژووردا
لە هەیوانو لە حەوشەدا
ئەبینران ئەهاتن ئەچوون •
لە کێڵگەدا

تۆویان ئەچاند ••
ئاوی جۆگەیان هەڵ ئەگرت
لەگەڵ منداڵێ گەڕەکدا ••
ڕایان ئەکرد •• بازیان ئەدا •• پێ ئەکەنین •
شەوی هاوین
لە نێو پەڵو نێوان گەڵای درەختەوە
مانگ •• دەمو چاوی ئەوان بوو
لێو بە خەندە •• دەرئەکەوتن •
شەوی پاییزیش •• لە خەونی
ئاشناو ڕۆشناو هاوڕێدا
گەلێ جار ئەبوون **بە دوو مەل :**
باڵیـان سوورو
بەرسنگ سەوزو
لەسەر بەفری دوورە لووتکەی ،
بەر زەردەپەڕ •• هەڵئەنیشتن •

× × ×

ئەگەرچی ئەو ساڵە
هەڕەشەی ئاگرو ئاسنی زەندرمە :
بە پەتو مێخ کێشان
بە زمان لە بندا بڕینو ••
بە سونگیو بە قەمە
مۆتەکەی ژیانی سەرسنگی
خەڵکی بوون ••

تاقیبی بەردەوام ..
چیتان کرد ؟ لە کوێ بوون ؟!
بۆچی چوون ؟
ئەگەرچی هەندێ کەس ..
بۆ پاشا بوون بە ورچ ،
بە مەیمون .. بە سەگی چوار چاوو
لە شەودا .. خۆیان کرد ..
بە خێوو .. جنۆکە .. بە درنج
بەڵام ڕێی هەتاوی
پیربالْو کاکە لاو ..
ئەو زەنگەی پار نەورۆز ،
لێیاندا .
تاریکیی نەیوانی قووتیداو ،
هەڕەشە نەیتوانی کپی کا !

× × ×

بەرداشی ساڵ سووڕا
وا نەورۆز خەریکە جارێتر
سەربات و بێتەوە
نزیکە .. کراسی گوڵاڵە لەبەرکا
نزیکە .. دەسماڵی وەنەوشە ،
بەشانیا بدات و
کڵاوی نێرگزو گەزیزە ،
لەسەرکا ..

نزیکەو بە سەردان
جووت برا دێنەوە
ماڵ بە ماڵ ئەگەڕێن تا جەژن ،
ئەڕواتو ئەو ساکە ،
ناوەستن •• ئەچنەوە !

× × ×

بە دوو ڕۆژ پێش ئەوەی
کە نەورۆز بێتەوە ••
لەشاردا •• ماڵەو ماڵ ••
بانگێکی نەهێنیی •• دەماغو
دەماك •• هەڵبەستوو •• ئەگەڕا
بانگ وەکوو هەرێزو پەڵەهەور
تەنێوە ••
بانگ ئەی‌وت :
بۆ ئەوەی کە نەورۆز
بڵێسەی بەرزتر بێتەوەو •• نەکوژرێ
با چاوگی ئەو گڕە « بیرمان » بێ
بۆ ئەوەی درەختێ کە ناوی کاوەیی
لەسەر بێو بمێنێ •• با ڕەگی ئەو دارە
بنج بەستی •• دڵمان بێ ••
بۆ ئەوەی •• کە گیانی پیربالو کاکەلاو
شادبکەین
با هەموو •• هەر هەموو

ببینە هەزاران پیربالو تا ئەلاو

تا بچین بە باوەش :

هەتاوو نانو گوڵ بێنینو

بینەین بە ؟ هەژاری ڕەنجخوراو •

× × ×

کەژاوەی ئێوارەی نەورۆزی

سەوز هـات

هێشتا خۆر چەند ڕمێ

بەرزتر لە کەنار خۆرنشین ،

وەك دەمی تەندورێ ئەسووتا

شار کڕبوو • بێ دەنگیی گۆمێك بوو

زۆر سامناك

هەر کە خۆر یەك دوو ڕم

چووە خوار

ئەنگۆرە دەرکەوتو تاریکیی ،

حوچێبوو بازیداو بە گوڕ هات •

ئەو ساتە بێ دەنگیی تەقیوە ••

لەناکاو •• لە جیاتی دوو ئاگر

هەزاران ئەستێرەیَ ئاگرو ،

مانگ لەسەر ، سەربانی

شار هەڵهات ••

بانیژەی ماڵ نەما ••
هەورەبان •• سەرقەڵا •• سەرگومەز
گۆڕەپان •• ناوکۆڵان •• گردەکەی سەرقەبران ،
قوتکەکان •• نزمو بەرز •••
شوێن نەما ••
کە کڵپەی ئەم ئاگرە پیرۆزە
بۆی نەبێ •• بە مەشخەڵ
بۆی نەبێ •• بە چرا
لە شاردا •• قەدێکی درەختو دار نەما
گەورە بێ •• یان بچووك
باریك بێ •• یان ئەستوور
چنارو •• دارەبەن •• دار بەڕوو
دار مازوو
شۆڕەبی •• گوێزو توو ••
بە نووسین •• یان وەکوو نیشانە
بۆ کاوە •• بۆ نەورۆز
نەبێ بەو مژدەیەی
پێش وەخت نێرگزی
ئەم ڕۆژەی میوانە !
جا ئیتر •• پاشاو بەگ
ژەندرمە •• چی ئەکەن ؟ کێ ئەگرن ؟

چەند درەخت لە بندا هەڵکەنن ؟
ئەوەتا وا لە پاڵ هەزاران ئاگردا
هەزاران پیرباڵو کاکەلاو
ئەو ئاگری نەورۆزە خۆش ئەکا ٠

---

★ ئەم قەسیدەیە لە ژمـارە ( ٥٧٩ )ی ڕۆژنامـەی هـاوکاری ژمارەی تایبەتی نەورۆزی ١٩٨١دا بە ناتەواوی بـڵاوکرایـەوە وا ئەمجارە دەقی تەواوی ئەخەمەوە پێشچاوی خوێنەران ٠

ش ٠ ب

# بەیتا کەوا *

عبدالرحمن مزوری

پیرەکێ کاڵ
بو زاروکێن خو ڤەدگێرا :
— دیسا بەفرێ ،
خەرزێ خو کێشابو واری
ئەسمانی شینیا خو هاڤێت ..
خو گوهوڕی ،
ترش‌و تاری
باری .. بەفر
بەفر .. باری
نەبن بەرمان ، نە کەوچەرین
بە تەن‌و مل
تەف چیاڵو ئاڤارو گل
.. بەفرێ هونین
نێچیرڤانان ..
وەسا زانی ،
بو وان دەلیڤەکا تەڕە

---

★ . ژ دەستویری‌یا هۆزانڤانێ مەزن بەکر بەگێ ئەرزی کو بەیتەکا بهەمان ناڤونیشانێ هەی .

ع . م

تەیک کوولاْن
داڤو بەندك بەلاْڤکرن ،
•• چاندن لدوولاْن
دبێژن بابــو :
ئەوێ سالێ
کەو نەڕابون •• مشەخت نەبون
پێگڤە هەمیـا ،
چەپــەر ڤــەدان
بەربێکێن خـــو ،
•• کوك گرێدان
چ بەفرا کەت ••
ئەوان قوتـا
چ شیرێ هـات ••
کرنــە دوتـا
ساڵ هــەر زڤڕاند ،
•• کرە بهـار
نێچیرڤانێن مە ڤەگەڕیان ،
دەست ڤالاْو سار
دبێژن بابـــو :
ژوێ سالێ وەر
نێچیرڤانێن مــە ،
دڕوی ڕەشن ، دڕوی تەنینە
کەوا ژی دبەفرێرا گەرمەو ••
هەر دقەبینــە !

# چوار پارچە شیعر

حەمە سەعید حەسەن

## ١ ـ بانگەوازێك

ئەگەر شیعرێ رەنگی گەشی
گوڵاڵە سوورەی کوێستانی نەگرتبوو
بۆنی خۆڵی پاش بارانی نیشتمانی نەگرتبوو
ئەگەر شیعرێ رەنگدانەوەی
خەمو خواستی ، ناخی گەشی رەنجدەر نەبوو
دەنگدانەوەی سروودی هەموو گەلێکی
سەرسەختو کۆڵنەدەر نەبوو
ئەگەر شیعرێ لە کارگەی گەورەی شۆڕشی
زەحمەتکێشانی جیهانا
ئامێرێکی هەرگیز رانەوەستاو نەبوو
لەبەردەم رەوتی مێژووا
چرایەکی هەمیشە داگیرساو نەبوو
گوێی لێمەگرن
گوێی لێمەگرن نازانم بۆ
گوێ بۆ شیعری قزمو ترسنۆك شل ئەکەن

نازانم بۆ شاعیرەکەی نادەنەبەر
توێکڵە شووتیو هێلکەی بۆگەن

× × ×

٢ ـ **چارەنووس**

ئەوی رۆژێ گوڵێ ئەدا لە بەرۆکی زۆرداریێ
ئەبێتە هۆی شکاندنی شووشەی دڵی دڵداریێ
بەربەستێکی بۆ بەردەمی رەوتی گورجی رووباریێ
بارانێکە بەسەر کێڵگەی میرا نەبێ ناباریێ
وەکو کوللە بەر ئەبێتە گیانی دەغڵی جوتیاریێ
سەنگەری بەرامبەر ئەگرێ لە سەنگەری هەژاریێ
ئەبێتە چاوی سیخوڕو پردیشە بۆ نەیاریێ
لە سەرەنوێلکی مێژووا شاد ئەبێ بە کەناریێ

× × ×

٣ ـ **مێژوو دڵی وەك بەرد وایە**

ئەو کاسکێتەی نەبۆتە چەتری سەرێکی
وەکو سەری ئەوی وتی :
( چاوەڕوانی سنووقی هەڵبژاردنو دەنگدان مەبن
تەنیا بۆ هێز گەردنی کەچ ئەکا دوژمن ٠ )
ئەو کاسکێتە وەکو جووتێ پێڵاوی کۆن
لە زبڵخانەی مێژووا
جێگە بۆ خۆی ئەکاتەوە
مێژوو دڵی وەك بەرد وایە

بە چاوی پڕ لە سۆزەوە ئاوڕ لە کەس ناداتەوە
شوێن چی کەوتوون !
ئەی نابینن هەواری ئێوە کام دۆڵەو هەواری ئەو
لە کامە دۆڵی ترایە !
نازانم چۆن لە سێبەری درەختێکا ئارام ئەگرن
نە رەگی بە کێڵگەی دڵی فراوانو
نەلقی بە مەلی هیوای ئایندەتان ئاشنایە
( ئەو دیوارەش کارتۆنی‌یەو یەکەمین پاڵ هەرەس دێنێ )
ئەوی داوای یەکەمین پاڵی لێ کردن
کە ـ گابۆن ـ یش پێشەنگتان بوو
پشتی گرتن
ئەوی شنەی کامەرانی بە گوێی ناخما ئەچرپێنێ
ئەمجارەیان خۆتان پێشەنگی خۆتانن
ئەمجارەیان گابۆنو قەیسەر ئەناسن
ئەمجارەیان لە ژێر پاژنە ئاسنینەکانی ئێوەدا
سنوور کۆنە قەوانێکە ،
هەر پارچەی ئەگاتە شوێنێ
ئەمجارەیان راکشاوەکەی گۆڕستانی ـ هایگێت ـ ی کپ
مەزارەکەی جێ ئەهێڵێو
چۆڕ لە پێکی شادی ئەبڕێو
سەما ئەکاو
دەستی لە گەردنی یارە دێرینەکەی دەئاڵێنێ ..

× × ×

## ٤ ـ شەپۆلی شەقام

( بۆ ڕاپەڕینەکەی بەری ڕۆژئاواو شارانی تری فەلەستینی داگیرکراوو هەموو هەژاران ... )

لە وشکە کەڵەکی تەختی
سوڵتانی گەورەو بچووکا
لاشەی هەزاران چەوساوە ، هەڵچنراوە
هۆلاکۆ بەسەر زیندووە
جەنگیزخان گەڕاوەتەوە
هیتلەر ماوە
کەچی ئێستاش
کارگە گەردی گۆڕستانی لێنیشتووە
شەقام بۆنی خوێنی مەییوی گرتووە
هەژارینە :
کەی دەروونی ئاگراویتان دێتە کوڵ
کەی هەوری هەناسەی ئێوە ئەگرمێنێ
کەی پەڵەی بارانی ئێوە
خەنەی خوێن بۆ ،
دەستەو پەنجەی بووکی وەرزێکی نوێ دێنێ
هەژارینە :
کەی دەست ئەدەنە قامچی ڕق ؟
کەی ئەسپی غەزەبی ئێوە ئەحیلێنێ ؟
ئەسپێ ئێوە تاوی نەدەن
زین بە خۆیەوە ناهێڵێ ،
دەمی شل ناکا بۆ لغاو

سوار ئەگلێنێ ،
هەر کاروانێ پێشەنگەکەی ئێوە نەبن
ناگاتە جێ
هەر کانیاوێ ئێوە جۆگەی لێ هەڵنەگرن
ناگاتە دێ
هەزارینـــە
ئەوی رێبواری کاروانی ئێوە نەبێ ، تاوانبارە
ئێوەی پشکۆی ئاگردانی ئێوە نەبێ ، تاوانبارە
کە لە رووباری شەقاما شەپۆل ئەدەن
ئەوی دۆستی شەقام نەبێ ، تاوانبارە
کە لافاوتان روو ئەکاتە کۆشکی نەوەکانی نیرۆن
ئەوی هەوێنی شالاوی بەسام نەبێ ، تاوانبارە

# ســـترانو بەفــرو ئاگر

**موئەیەد طەییب**

**پێشەکی‌یەك ..**

گوتن « هەی هۆ
روژا چەکوچێ کاوەی چوو
ناهێتەڤە
ل وەلاتەکی ئەژدەهایەکێ بتنێ هەبوو
هەتا سەرو تاج لێ‌هاتینە هەرشین
هزار سەر هاتنە برین
نها ... نهۆ
ل هەر شارەکی ...
ل‌هەر گوندەکی
ئەژدەهایەك یێ‌دخورێتن »
لێ نەگوتن « ل‌هەر شارەکی ...
ل‌هەر گوندەکی
ب‌هزارا رێنجبەرو جوتیارو پالەنە
هەمی جوتیارو پالەژی ...
ئەڤرو چەکوچو کاوەنە » ✓

-١

نە ئەزبەنی ••
نەکە کەنی
وەلاتێ من بەفرە •• بەفرەو
کەنگی بەفر بویە تەنی ؟ !

-٢

نە ئەزبەنی
نەکە کەنی
وەلاتێ من نەرویبارە
لناڤ دەریایێ بەرزە بیت
وەلاتێ من نەبوهارە
هاڤین دێهێتو چرمسیت
نەء ••• وەلاتێ من چیایەو
چیا ژجهێ خوٚ نالڤیت
بەفرا مەژی هەراکەتیو
هەر دێکەڤیت

-٣

وەلاتێ من هەی بەفرو خوین
تو نەباغی
دا ئەزبێژم •••
ئەو باغێ گاران تێچەرین

ن - یین
تو نەلەعلی‌خانی‌و ئەز هەسەماغامە
دا ئەزبێژم •••
ئەو سینگێ هاتیە پەرخین
من ژێ نەڤێت ماچ‌و ئەڤین
نەء •• تو بەحری‌و
بەحر بدەڤێ « سا » پیس نابیت
دل ژعەشقاتە ریس نابیت

## -٤

وەلاتێ من هەی بەفرو خوین
دەمێ شەڤ‌و تاری دڕەڤین
روژێ هێدی ••
تیرۆژکێت خو بەلاڤ دکرن
من چاڤێت خو ژێك ڤەدکرن
دا سەحکەمە •••
چیاو دۆل‌و نەهالێت‌تە
من دگوتی •••
هەوار تو چەندێ مازنی
تو بەحرەکی‌و یا بێ‌بنی
لێ روژەکێ •••
برینەك دسینگێ من چێبوو
دەرێ برینێ هەر ڤەبوو
هەتاکو بویە پەنجەرەك
من تێ‌رادیت

دلێ منێ کریە هێلین
هینگێ من زانی سینگێ من •••
ژ چیا پڕە
تویێ بچویکیو دلێ من ••
هێژ ماسترە

-٥

وەلاتێ من خوینو کەڤی
کێ گوتییە •• تویێ کەتی
یان دێ کەڤی
گەرتو کەتبای
چەوا ••• گەمی دابرِویبارادا هێنەخار
چەوا ••• روژا مەداهەلێتو ئاڤا بیت
بیتە سپێدە ••
بیتە نیڤرو ••
بیتە ئێڤار
چەوا ••• شێرێتتە داخوڕن
چەوا ••• شڤان دابلویلێت خو هەلکرن
چەوا ••• پەراسی دادلێ من ڤەگرن ؟!!

-٦

وەلاتێ من
چەند دوو چاڤێت رەشو بەلەك
دکەڤنە سەرێك
دوو نێرگزێت شەنگو شەپاڵ

د گەفنە بەریك
ئو هۆسا دێ روژەك هێتن
دێ بیە مێرگەکا خەملین
ستری نابن ••
دەستو تلێت زاروکێت مە خوینەلوکەن
ئەڤجا دەمێ ئێڤاری‌یا ••
ژ ئاقاری تێن
دێ سروودا ئاشتیێ بێن
بێریڤانێت گوندێ مەزی
شینا شکەفتا
دێ لدەرێ خانیکێ ئاڤا
مەشکێت خو کێن

## فەرهەنگۆك

**ئامادەکردنی : نووسەری کورد**

تیرۆژك : تیشك
ڤەدکرن : دەکردەوە
سەحکەمە : سەیربکەم
چێبوو : دروستبوو
ڤەبوو : کرایەوە
ماسترە : مەزترە ، مەزنترە
هێلین : هێلانە
گەمی : بەلەم
هێنەخار : دێنەخوارەوە

شڤان : شوان

بلوێل : بلوێر

پەراسی : پەراسوو

هۆسا : ئۆسا ، ئۆسا ، ئاوا

هێتن : دێتن

ستری : درك

تلی : قامك ، پەنجە

زارۆك : منداڵ

ناهێتەڤە : نایەتەوە

بتنێ : بەتەنیا

هەرشین : ڕووخان ، ڕمان

سەرهاتنەبڕین : سەربڕران

نـا : نهۆ ، ئێستا

ئەڤرو : ئەمرۆ

نەکە : مەیکە

کەنی : پێکەنین ، گاڵتە

تەنی : یا ( ظەنی ) ، ڕەشی مەنجەڵ

بەرزە : بزر ، وون

هاڤین : هاوین

چرمسیت : سیس بێت .

نالڤیت : ناجووڵێت ، نالەقێت

گاڕان : ڕانەگا ، گاگەل

سـا : سـەگ

ریس : ڕووس ، ڕووت

دڕەڤین : دەڕەوێنەوە ، هەڵدێن

# خۆرەتـــاو

**مارف عومەر گول**

چۆن بتوانم هەرچی وشەی میللەتانی زەوی هەیە

کۆی کەمەوە ، شیعرێ بڵێم ،

هەموو جیهان گوێی لە دەنگی هاوارم بێ

هەموو کەسێ لێم تێبگا

گوێی لە هاژەی گەردەلوولی ئازارم بێ

چۆن بتوانم تەنیا باسی یەك ڕۆژ دیلیی

بنووسمەوە بە هۆنراوە

کچۆلانی سەرگۆی زەوی بیکەن بە ویرد

بڵێن ئەوەی شیعر بڵێ بۆ نیشتمان

هەتا دەمرێ سەوداسەری خۆرەتاوە •

★ ★ ★

جێم نەهێشتی کە سروودی هەمیشەییم بکەی بە خەم

بە ڕوومەتی تەمەنتەوە

لە سەفەری کاروانێ بووم بە پێی پەتی

بەسەر چیای ( مەحاڵ )یشدا سەردەکەوتم

ئەوەی ژێرپێی لەو ڕێیەدا گرێ گرێ لێك بێتەوە

شەونخوونی بکا بەدیار هیوایەوە

چاوی دەبێ بە گۆمی خوێن

دەستی دەبێ بە درەختێکی چەماوە

جەستەی دەبێ بە کراسێ ئاوداما مۆر

ئەوەی یەك ڕۆژ چاوبەستی کەن

هەتا دەمرێ بیری لەلای خۆرەتاوە •

# خۆتۆ خەم نیت !

**شیعری : جەمال غەمبار ـ ١٩٨٠**

زەمانـێ بـوو ..
لای تۆ ژیان کەشتی‌یەکی تێکشکاو بوو
لەمیانەی شەوو رۆژێکا ،
چاوەڕوانی مردنێکی کتوپڕ بوو ..
زەمانـێ بـوو ..
لای تۆ ژیان درەختێکی شکستەی بەر
باڕەشێ بوو
تەوری نائومێدیی تەمەن ..
لق و پۆپی دائەپاچی ..
چ زەمانێکی نەهات بوو !!
لە مەداری بیری تۆدا ،
خۆشەویستی نەخۆشی بـوو
ئەستێرەیەکی نەزۆك بوو
تروسکەشی پێ نەئەگەی !

زەمانێ بوو ..
حەزت وابوو ڕۆژ زوو بڕوا و ،
شەویش زوو بێت
حەزت وا بوو ، کە ئەبەدیەت نەمێنێ
کێوی ژیانت ،
لە نێڵەی بورکانی مەرگا
بتوێتەوە ،
زوو بڕوخێ ...

زەمانێ بوو ..
ئاوا ئەژیایت ..
دڕك چاوی وشەکانتی کوێر کرد بوو
شەو هاوڕێیەکی بەوەفای دەروونت بوو
خەوە جوان و گوڵ گوڵیەکان
لە چاوەکانت تۆرا بوون ،
ڕۆژگارێ بوو .. ئاوا ئەژیایت !!

× × ×

زەنگی ئەم وشانە ، لە گوێیەکانما لێ ئەدەی ؟
گوایە تەنیا لە شەوێکی پڕ نەهاتی
تەنیاییما
تۆم لەناو ویژدانی خۆما هەڵگرتبێ
گڕی ئارەزوویەکی بێجڵەو

تۆی لەلام خۆشەویست کردبێ ••
ئەم وشانە ئەبنە پشکۆ
دەروونیشم چەند گەرم بێ ،
داخی ئەکەن !!

× × ×

لە ژیانما ، پێنج جار گریاوم ••
جارێك ، بۆ وولاتێکی سەربڕاو
جارێك ، بۆ کڵۆڵیی ئافرەتێك
کە پێی ئەڵێم ؟ « دایە » !
جاری سێیەم ، بۆ ئازارەکانی تۆ
جارێکیشیان ، بۆ هاوڕێ خۆشەویستەکەم
جاری پێنجەمیش بۆ چاوم ••

٤-١٠-١٩٨٠
زاخـۆ

× × ×

ئێستاکە بوویتە وەنەوشە ••
ئێستا دڕك لە کوانووی گەرمی بڕواتا
ئەسووتێنی ••
تۆش ئەم وولاتەت خۆش ئەوێ ••

لەبەر تاڤگەی ئەوینێکی پڕ لەچێژی ئینسانی‌یا
خۆت فێرە مەلە کردووە ،
ئێستاکە بوویتە گولاڵە ..
ئێستا دڕک ، لە کوانووی گەرمی بڕواتا ،

ئەسووتێنی ..

× × ×

سلێمانی ١٤-١٠-١٩٨٠

# پـراگ

**شیعری : ڤیتز سلاو نیزڤال**
**ئامادەکردنو وەرگێڕانی : محمود زامدار**

لەیەکەم رۆژی ئـەم سەدەیـەدا ، چاوی بۆ دنیـای ژانو ئاژاوە هەڵێناوە •• دوای (٥٨) ساڵ ، زۆر سوریالیانە بەرۆکی ئەم دنیایـەی بەرداوە • • لەپێشەنگە دیارەکانـی جولانەوەی نوێخـوازی شیعری چیکی‌یە •• لەهەرزەکاریدا وەکو شاعیرێکی واقیعی هاتەکایە •• کەچی دنیای پڕ لەجادوبەندو سیحراوی «شیعر» وازی پێ لێ هێنا ، تا بەیەکجاری کەوتە ژێر تەئسـیری سوریالیزمی فەرەنسایی ••• دیوانی « پراگو قامکەکانی باران ـ ١٩٣٦ »ی هێنی ئەم قۆناغەیەتی !

نیزڤاڵ لەو بڕوایە دایە کە :

« بەجۆرێکی زۆر لۆژیکانەوە ( بادە ) بەنـدە بە ( مێز ) ەوە •••
( ئەستێرە ) بە ( ئاسمان ) ەوە •• ( دەرگا ) بە (پەیژە)ەوە••••
هەربۆیەشە ئەم قسە رەمەکییانە کار لەمرۆڤ ناکەنو زۆر بەقووڵی باری سەرنجی راناکێشنو نایوروژێنن •• بۆیە ئەبێ ( ئەستێرە ) لەسەر ( مێز ) و ( بادە ) لەنزیك ( پیانـۆ ) و ( فریشتە ) و ( دەرگا ) لەرۆخی ( ئۆقیانووس )دا بێت •• مەبەستیش لەم کارە هـونەری‌یە ، سەرەندازکردنەوەی پـەردەیە لـەرووی واقیـعو

گەڕاندنەوەی وێنەی پرشنگداری ئەو واقیعەیە ، وەکو بڵێی :
یەکەم ساتی گوڵ کردن‌و سەرهەڵدان‌و بوونی پاکی ئەو واقیعە
بێت •• رزگارکردنی شیعریش لەرێڕەوی ئاسایی‌و کلاسیکی ، کە
مەنتیقی ئاسایی ( زمان ) بەسەر شیعرا ئەیسەپێنێ ( شتەکان )
لەپڕێکاو بەهەزاران پرسیاری واقوڕهێنەرەوە خۆی ئەنوێنێ ••
کە بێگومان ئەمەیان بەپشتمازەی شیعر دائەنرێت ••! »

ئەم دووپارچەیە ، نموونەیەکی سەرکەوتووی ئەم شاعیرە
ژانگرتووەیە ، کە شاری ( پراگ ) بەژانێکی هەوکردوو بەبیرێکی پڕ
لەشەبەنگەبەرۆژو بەسەرسوڕمانێکی پڕ لەخۆشەویستی‌و مەتەڵ‌و بەجوانی‌و
سرکی‌و ڕەوانی ژیانی مرۆڤانەوە ، سەرهەڵئەداو دائەڕژێ‌و ئەبێ بە
پانۆرامایەکی فراوان‌و زۆریش فراوان ••! گەلێ جار وابیر ئەکەیتەوە ،
ئەم کەش‌و هەوایەی شاری ( پراگ ) هەر هەمان شت بێت‌و لە هەندێ
لەشارەکانی ئەم کوردستانەی ئێمەدا خۆی نواندبێت ••!

## زەنگەکانی پراگ

زەنگەکانی پراگ بێدارتان ئەکاتەوە
تادەس لەدەفەکانتان هەڵگرن
زەنگەکانی پراگ
بانگتان ئەکا
بۆ سەر شەقامەکان
لەو ساتانەی کە بەدوای کچەنەشمیلەیەکا ئەگەڕێم ••
زەنگەکانی پراگ

بۆ ئەو دارەمەیتانەی نێو ئەم دڵەم ئەزرینگێنێ
کە چاوەڕێی هیچ ناکات
زەنگەکانی پراگ •• رابەریم ئەکا
تا لە تەڵەزگەکان دەرباز بم ••
زەنــگەکانی پراگ
هەمووتان بانگ ئەکا
ئەی ئەوانەی ـ بەبێ زانین ـ ناوەکانتانم
لەسەر باسکەکانما هەڵگرت •
زەنــگەکانی پراگ
بانگ بۆ چاوی زیتی ئەو پشیلانەی
کە تا بەر دەرگا راوەدوم ئەنێن ، رائەهێڵێ
پشتیش لەو پشتکۆماوە زەردەخەنە لەوتاوە ئەکات
زەنــگەکانی پراگ
هەموو هاوڕێکانم بانگ ئەکات
زەنــگەکانی پراگ
هەموو یادگارەکانم بانگ ئەکات
زەنــگەکانی پراگ
داوا لەو رۆژگارانە ئەکات ، کە مەرگی تیا نابێ بەگوناە
زەنــگەکانی پراگ
داوا لە گشت مشتەکۆڵەکان ئەکات ، گشت مشتەکۆڵەکان
تا لە شووشەی پەنجەرەکان بدەن •
زەنــگەکانی پراگ
هەموو ژنە رەبەنەکان بانگ ئەکات

تا ئەو ئەموستیلە سپییانەی کە لەدڵداری قەدەغەکراون وەدەرخەن •
زەنــگەکانی پراگ
بانگ لەو ژنە سۆزانییانە ئەکات
کە پیاوەکان بەدەم خەوەوە لەژێر بانیژەی پەنجەرەکانیان رەت ئەبن •
زەنــگەکانی پراگ
داوا لەمناڵەکان ئەکات ، تا بەیەکەوە بێن و لەرووی ئەستێرەو شالوورێکا
یا لە رووی ئەو شتە سامناکەی کە وەك
باربوویەکی میری یە ، هەڵشاخێن و بڵێن :
بــۆ •• بــۆ •• بــۆ •• ؟
زەنــگەکانی پراگ
بانگی هەموو شێتە تووشبوەکانی مەنەخۆلیا ئەکات •
زەنــگەکانی پراگ
بانگ بۆ ئەو ئەستێرانە رائەهێڵێ
کە شەوێکی میهردار ، خوێنیان ئەرێژێ ••!!

★ ★ ★

## پراگ لەژێر خۆری نیوەڕۆدا

لەهیچ خەونێ بێدار نەبوومەتەوە
بەهیچ شەمەندەفەرێکی تیژڕەو ، نەگەیشتووم
وەکو گەشتوەرێك
دڵم لەهیچ دیمەنێ نەگوشراوە
چەندین ساڵــە

هیچ کتێبێکم لەبارەی سەربردەی جنۆکەکانەوە
نەکردۆتــەوە
چاوەڕوانیش نیم ، دڵداریی هیچ چەشنە رازێکی
گەردوون‌و ئەم جیهانەم بۆ بدرکێنێ
حەزیش ناکەم
لەگەڵ باڵندەکانا گۆرانیی بڵێم
یــا قسەی شاتوبات لەبارەی دیمەنەکانی ژێر زەریاوە
بــکەم .
چ جۆرە خەونێکی جرنی‌وفرنێ لەبارەی ئەو نەتەوانەی
کە حوکمی گەلان ئەکەن
یا ئەو خاکەداگیر کراوانەوە ، نابینم .
لەو باوەڕەدا نیم
ئەو گەلەی کە من بەزمانەکەی ئەو دەپەیقم
لە گەلانی تر ، باشتر یا خراپتر بێت .
من بەکارەساتەکانی جیهانەوە بەندم‌و
زۆریش لەژیان‌و مەرگ بێباکم .
لە درەنــگە بەیانیاندا
لە ژێر ئەو چەترە ئاڵوواڵایە دائەنیشم
کە ( پراگ ) دوای شەستەبارانت‌و هەڵمێکی وەنەوشەیی
لەبەردەمیا رائەکشێت .
لەبواری درەختە رەنگاورەنگەکانا بەدی ئەکەم
هەروەك چۆن پەرکەم گرتوویەك تارمایی ئەبینێ .. ئاوا ..
وەك پاپۆڕێکی زۆر گەورە ، کە بەدارپەردەکانی

قەڵابەند کراوە ،
وەك شارێکی سیحرلێکراو دێتە بەر دیدەم
وەك پاپۆڕی چەتەزێڕینەکانی زەریای سەمەرە
وەك خەونی ئەندازیارانی دڵگەشی ئەپارتمانەکان
وەك شوێنێ کە بۆ سیحرو جوانی ڕاخرابێت
وەك کۆشکی پەروین ، کەلەپڕێکا
دەروازەکانی بۆ خۆر کردبێتەوە
وەك قەڵایەکی ئاگرپڕژێن ، کە قامکی شێتێك
دایتاشیبێ ،
وەك ڕابەرێ بۆ سروشەیەکی تێکڕایی
وەك بورکانێکی زیندوو
وەك بازنەیەك کە لەبەردەم ئاوێنەکانا شۆڕئەبێتەوە
بەدی ئەکەمو ئەیبینم ...
ئێستا نیوەڕۆیە
( پراگ ) ئەخەوێ ، بەڵام وەك ئەژدیهایێکی دێرین بێدارە
کەرکەدەنێکی موبارەکەوە قەفەزەکانی ئاسمانە
ئۆرگنێکی تۆزاوی‌یەو ئاوازێکی بەسۆز ئەژەنێ
نیشانەی زیندووبوونەوەو گەنجینەی زەریاچە وشکەکانە
سوپایەکی زرێپۆشە سڵاو لەئیمپراتۆر ئەکا
سوپایەکی زرێپۆشە سڵاو لەخۆر ئەکا
سوپایەکی زرێپۆشەو بووە بەبەردەپیرۆز ...
ئەی شارە جوانکیلەکەم
بەو چاوانەی کەسۆمایان هاتووە
تێر تێر سەیرت ئەکەم
قووڵ .. قووڵ بەدواتا ئەگەڕێم

داخ ! ئەزانم ئەمڕۆ
تۆ وەك ئاگری نێو تاشەبەردەكان
وەك ئەندێشەی هەتەربووم ، بووی بە مەتەڵێك
جوانییت لەنێو ئەشكەوت‌و ئاقیقە دڵگیرەكان دائەڕژێ ...
تۆ وەك مێرگەكان ، كۆنیت‌و گۆرانیی
لەسەرباڵیان ئەپژێنی .
كاتێ كەكاتژمێری بورج‌و بارۆەكانت لێئەدا ...
تۆ وەك شەوی دورگەیەكی نەدۆزراوت لێ‌دێ
تۆ وەك گۆڕە پیرۆزەكان
وەك تاجی پاشاكانی ئەسیوبیا ، نەمرییت .
وەك مەتەڵی دڵداری‌و پەڵەهەورە دوورەكان
وەك مەتەڵی قسەو بیرە پاكەكان ، جوانییت
وەك بەردەكانی بەرلێشاوی باران ، جوانییت
وەك مەتەڵی خەونی ئەستێرەو چریسكەی فسفۆر
وەك مەتەڵی هەورەتریشكەو فانووسی سیحری‌و شیعر
جوانییت (١) ... !

---

(١) ئەم چەند لاپەڕەیەش بەشێكە لە كۆشش‌و بەری بە پیتی پینووسی مەحموود زامدار زۆرمان حەز دەكرد شتێكی زیاتر دەربارەی شاعیر بزانین ، تا باش لەو ڕەمزو كەمە تەمە بگەین ، كە بە ناوی جوانیی ڕوخسارەوە خوێنەر دەخاتە گێژاوێكی تێ‌نەگەیشتنی ناوەڕۆك . وەباڵ بە ئەستۆی زامداری تەماوی‌و نەناسینی تەواوی شاعیر ، بڵاوكردنەوەی پێ دوا نەخستین .

**نووسەری كورد**

# لوبنان ناکەوێ

**شیعری موسى النقدي**
**عەزیز رەشـــید حـــەریری**
**لەعەرەبی‌یەوە کردوویەتی بە کوردی**

دوور نی‌یە پردەکەی پاشا بکەوێ ،
هەروەها « تەل زەعتەریش » ؛
بەڵام هەرگیز هەرگیز لوبنان ناکەوێ‌و لە نێو ناچێ ...

★ ★ ★

لوبنان دەگەڕێتەوە باوەشی دایکی نیشتمان ؛
دوای ئەوەی بە نێو ئاگردا ڕەت دەبێت .
دەگەڕێتەوە بۆ باوەشی گشت سەربەستی خوازان .
لوبنان دەریایەکە لەناکاو لە تاریکایی‌دا دەردەبێت ؛
بەڵام قەت ئەو کێوەی لە تەرمی شەهیدان
دروست بووە ، ژێر شەپۆلی خۆی ناداو نایخنکێنێ ..

★ ★ ★

ئەو مرۆڤەی لە لوبنان گەڕاوەتەوە چیرۆکەکەی خۆی دەگێڕێتەوە ؛
شایەت پیرێکی سەربڕاوە ؛ منداڵێکی بریندارە ...

دار ئورزەکەیش ئافرەتێکی باڵا لە قوڕ هەڵکێشراوەو ؛
کەزیەکانی پەرش‌و بڵاو بوونەتەوە ..
ئافرەتێکی لە چوار مێخە کێشراوە ..

★ ★ ★

دەشێ دڵۆپێ ئاو بڕژێتە نێو « منداڵ دانی » زەوی‌و ،
بەردێکی لێ وەپاش کەوێ . .
لەوانەیشە بارانێ بباریێ تا بەردەکانی ناخی زەویش
دەربهێنێ ..
بەڵام هێشتا مرۆڤ هەر دەمینێ !.
بۆیە دەڵێم ، لەوانەیە پردەکەی پاشا بکەوێ‌و ،
هەروەها « تەل زەعتەریش » ...
بەڵام هەرگیز لوبنان ناکەوێ‌و لە نێو ناچێ ..

★ ★ ★

# پێداچوونەوە ... سەرنجێك

دوكتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

نووسەر بە ژمارەی پێشووی گۆڤارێكدا بچێتەوە كە خۆی سەرنووسەرێتی ، ئەمە ڕەنگە دیاردەیەكی تازە بێت ، لەلایەكەوە بدرێتە پاڵ دیموكراتێتی لە نووسین‌و بلاوكردنەوەداو ، لەلایەكی‌ترەوە ڕەنگە شەقلی ئاگا لێ‌نەبوونی پێوە بنرێت •

لێرەدا پاكانە ناكەم ـ بەڵام لە ڕاستیدا ، ئەگەر برایانی نووسەر ، چ لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرو چ لە دەرەوەی دەستی یارمەتیان ، لەم ژمارە یا ئەو ژمارەی نووسەری كورددا درێژ كردبێت‌و هەندێك ئەركی چاپخانەیان گرتبێتە ئەستۆ ، ئەوا ئێمەش هەندێك جار لە هەڵبژاردنی كەرەسەدا سەربەستیمان داونەتێ • ئەمە بە هەندێك ژمارەوە دیارە • بەڵام بە گشتی تا ئەم ژمارەیە ، ئەركی تەواو كەوتۆتە سەرشانی برامان مامۆستا محەمەدی مەلا كەریم ، كە بەو كۆششە مەردانەیەی لەگەڵ تیپی كوردیدا ژیانی پێ بردۆتە سەر ئارەق‌و هۆش‌و چاوی تیژی بۆ زوربەی ژمارەكانی نووسەری كورد خستە كارو بەرەو ڕووناكیی بردن •

ئەگەر لە ژمارەكانی پێشووتردا ، هەمیشە هەر خۆی تەنیا نەبووبێت، ئەوا ژمارەی پێشوو كاتێك دەرچوو ، من لە سەفەر بووم ، زوربەی كەرەسەكانم نەدیبوو ، مافی تەواو درابوو بەو ، ئەوەبوو ئەو ژمارەیە دەرچوو •

مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم ، نووسەرێکی دڵسۆزو ئەدیبێکی لێهاتوو ، شارەزایەکی کوڵەدەرەی ئەدەبیاتی کوردی‌یە • بۆ نووسین‌و نووسینەەوەو چاپی ووشەی کوردی ، زەحمەتکێشانە دەچێتە مەیدانەوە •

دیارە بۆ یەکێکی وەك من ، ستایشی ئەو دەبێتە ستایشی خۆم • چونکە سی‌وسێ ساڵە گەلێك ئەشك‌و ڕەنج‌و ئازارو یەکێتی‌ی هەوڵ‌و بیرو ئایدیۆلۆژی لە میحرابی ووشەی کوردی‌و خەباتدا پێکی‌یەوە بەستووین‌و ڕەگی پێوەندیش زۆر قووڵترە لەوە •

ئەم سەرەتاو باسەم لەلایەکەوە یادگارو یادداشتە ، نەك ئەمە دووا ژمارەی « نووسەری کورد » بێت • لە لایەکی تریشەوە ، بەدەنگ‌هاتنێکی بچووکە بەرامبەر بەوەی ، ئەو « سەگ‌وەڕەی » هێشتا بەدووای گۆرانی مەزنەوەیە ، لەبەر کۆششی مەردانەی ئەو بۆ هەڵکردنەوەی چرای گەشی گۆران ، لایەکی بەلای ئەویشدا لە « ژێر ئاوەوە » کردۆتەوە •

لەولاتریشەوە ، لەپاڵ هەموو یەکێتیدا زۆر جار لاوەکی باری سەرنج‌و چێژو هەستی ڕۆژنامەنووسیمان لەگەڵ کاك محەمەددا یەك ناگرێت • هەر لەبەرئەوە لەکونجی ڕەخنەوە دێمە مەیدانی باسکردنی ژمارەیەکەوە ، کە لەبەردەمی خەڵك‌و یاسادا لێپرسراوی هەموو تیپێکیم ، بەڵام لەولایەنەیانەوە ئەم سەرنجانەم هەیە •

**ووتەی ژمارە :**

ئەم ووتارە من نووسیبووم‌و بەجێم‌هێشتبوو ، بەڵام کاك محەمەد هەقی‌دابوو بەخۆی ـ لەپاڵ پەیڕەو کردنی ئیملاکەی خۆیدا ـ لە هەموو ژمارەکەدا ـ کە لە هەندێ بارو نووسینی ئەو ئیملایەدا یەك ناگرین ، دەڵێم لەپاڵ ئیملادا ، هەقی دابوو بەخۆی کە هەندێ ووشەش بگۆڕێت‌و

دوو ووشەی بۆ خۆ دروست کردووی « بنووس »و « بخوێن»ی بەسەر ووتارێکدا سەپاندووە ، کە من نووسیوومەو ناوی « سەرنووسەر »ی بەسەرەوەیە •

دەمێکە ئێمە ووشەی « خوێنەر » یا جاروبار « خوێندەوار »یش لەجێی ئەم « بخوێن »ە دادەنێین • ڕاستە « خوێندەوار » جاروبار بۆ « ئەنتلیگێنت » ی ڕۆژئاوایی یا « مثقف »ی عەرەبیش بەکاردێت • هەر وەك نووسەر ـ جێی « کاتبو ادیب » دەگرێتەوەو « بنووس »ەکە تازەیە با لە شارەزووریش بەکارهێنرابێت •

تێکڕا تا ئێستا لەڕووی چێژەوە خوێنەرو خوێندەوارو نووسەرم بەدڵەو ناچمە گێژاوی « ئەتیمەلۆژی »ی ( بخوێنو بنووس )ەوە بەڵام وەك ( نرخاندن ) ـ ترخێنەم دێنێتە بەرچاوو ( هەستیار )ی بەهەڵە لە ( شاعیر )ی عەرەبی‌یەوە دروستکراو ( کەمتیار )م دێنێتە بەرچاو ، ئەم ووشانەش شتی‌تر دێننەیادو تائێستا لەگەڵ بەکارهێنانیان نیم (١) •

جا لێرەشدا ـ لەم پاشاگەردانی‌ی ئیملاو ئیستیلاحەدا دەبوو ووشەی ( بخوێن )و ( بنووس ) نەخاتە ناو ووتارەکەی منەوە •

★ ★ ★

کە ووتارێکم دەربارەی ( مەمو زین ) دی ، دڵم کرایەوە • بێگومان

---

(١) جارێك ووتارێکم بۆ ( بەشیر موشیر )ی رەحمەتی نووسیبوو • ناوەکەیم بەوجۆرە نووسیبوو کە دەیبینن ـ ووتی :
ناوی ئەمین ـ واتەمن ـ مەکە بە مووشیر •
واوتم : مامۆستا بەپێی ئیملای تازە وا دەنووسرێ •
ووتی : ئیملای تازەیە نی‌یە ، کەیفی خۆتانە ، ناوی خۆتانی پێ بنووسن ، با وەهبی بێگیش ناوی خۆی پێ بنوسێ ، ناوی ئەمینی پێ‌مەنووسن • بۆ ئەمین هەر بنووسن ( بشیر مشیر ) •

من خاوەنی مەمو زین‌و دەست‌بەسەرداگری باسی خانی نیم ، بەلاّم بۆ کەسێك کە چەند ساڵی ژیانی لەگەڵ بەرهەمێکدا بە دەرس ووتنەوەو لەسەر نووسین بردبێتەسەر ، ڕەنگە هەقی بەشداری‌و لێ‌پرسینەوەو لەسەرهاتنەجوابی لەو مەیدانەدا بدرێتێ •

لەبەر ئەمە هەر دەستم‌دایە خوێندنەوەی ووتارەکە ، ووردە ووردە تا تەواوم کرد ، سەرسامی گرتمی •

بەکورتی ـ خاوەن ووتار ـ تەنیا پێشەکی چاپی مەمو زینی گیوی موکریانی‌و هەندێك ( یا بڵێین هەموو ) بە عەرەبی‌کراوەکەی مەمو زینی محەمەد سەعید ڕەمەزان بۆتی‌و (١) لە کتێبەکەی من تەنیا پێشەکی‌ی خوێندۆتەوە • خۆی بەوەوە ماندوو نەکردووە کە هەموو مەمو زین بخوێنێتەوە ، هەرچی تێگەیشتن‌و چوونە ناو جیهانی خانی‌یە وابزانم لێ‌ی دوورە •

هەر بەدەم خوێندنەوەوە ئەم نیشانانەم دانا :

ـ نووسەر دەڵێ : ( لە تەمەنی چل‌و چوارساڵیدا ، نزیکەی پێنج سەدە لەمەوبەر نووسیویەتی ) •

برا : ئاشکرای یارو ئەغیارەو زۆر جار نووسراوە کە خانی خۆی لەباسی ساڵی لەدایك بوونیدا وەك نووسەر خۆیشی دەڵێ ، نووسیوی‌یە :

**لەورا کو دەما ژ غەیب فەك بوو**
**تەئریخ هەزارو شەستو یەك بوو**

---

(١) یەکێکی‌تر دوو ووتاری بە عەرەبی هەر بەم چەشنە بلاّوکردۆتەوە • لەشوێنێکی‌ تردا باسی ئەدیش دەکەین •

واته : خانی له ١٠٦١ ی هیجریدا لەدایك بووه که دەکاته ١٦٥٠ی میلادی ، چل‌وچوار ساڵی بخەسەر دەبێته ١٦٩٥ ، واته سێ‌سەد ساڵ لەمەوبەر کەمتر ، ئیتر پێنج سەدە لەکوێوە هات ؟

— له باسی ( پێرستو سەرەتا )دا نووسەر دەڵێ :

« لێرەدا بەگشتی باسی ئەوینی ( مەمو زین ) ئەکات » .

نەء ، برا : پێرستو سەرەتای مەمو زین ، سێ فەسڵە ، باسی خواو پێغەمبەرو باری نەتەوەی کورد دەکات . بەلام ئەو وەرگێرانە عەرەبی‌یەی پشتت پێ بەستووە ، ئەو سێ فەسڵەی لاداوە . وا بزانم جارێکی‌تر تەماشای سەرەتای کتێبەکەی من بکەیتەوە لەهۆی ئەوەش دەگەیت .

— وا بزانم ئەو وەسفانەی نووسەر لە زمان خانی‌یەوە داونی بە میرزەینەدین وەسفی خانی نین . پاشان ئەوەت لەکوێوە هێناوە که ( ستی )ی خوشکی میر ( بیستساڵ ) بووەو ( زین ) لەو بچووکتر ؟ . چونکه خانی باسی تەمەن‌و گەورەو بچووکی‌ی ئەم دوو خوشکەی نەکردووە .

— ( مەم ) ـ دیوان داری میر ـ نی‌یە ، بەڵکو ـ له مەمو زینی خانیدا کوڕی دەبیری میرە .

— نووسیوی‌یه : ( له نەورۆزدا میر ئەچێ بۆ ڕاو ) . فەسڵی جەژنی نەورۆز تەواو له فەسڵو وەسفی ڕاو جیایە . بۆ ڕاوچوونەکە زۆر پاش نەورۆزو بوونەیاری مەمو زینە . بەرگی خۆ گۆڕینی مەمو تاژدینیش له مەمو زینی خانیدا تەنیا بەرگی دوو کچە ، بەرگی دوو کەنیزەك نی‌یە ـ وەك نووسەر ووتوویەتی .

— ئەو کەسەی لە داستانەکەی خانیدایە ( تاژدین )ەو ( تاج‌الدین ) نی‌یە ، وەك نووسەر دەڵێ — بۆ ئەتیمۆلۆژیی ناوەکەش ئەوە ڕا هەیە کە ناوێکی خۆماڵی بێـتو پێوەندیی بـە ( تـاج‌الدیـن )ەوە نەبێت •

— نووسەر لەو بەندانەدا کە بۆ ڕووداوەکانی مـەمو زینی نووسیوە دەڵـێ : —

( ٨ — مزگێنی : گەورە پیاوانو ناسیاوانی بـاوکی تاژدیـن کۆئەبنەوە خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ خوازبێنی • وا بڕیار ئەدەن کە لە پێشەوە ستی بۆ تاژدین داوا بکەن تا کاری مەم ئاسان ئەبێ ) ئەم چەشنە خوازبێنی‌یە لە مەمو زینی خانیدا نی‌یە • لێرەدا نووسەر خانیو هەندێ گێڕانەوەی فۆلکلۆری تێکەڵ کردووە •

— بەڵێ لەناو خەڵکدا — بەتایبەتی لەناوچەی ئێمەو لەو مەمو زینەدا کە پیرەمێرد نووسیویەتی ، قوتبی سالیبی داستانەکە بە ( بەکـر مەرگەوەر ) ناو دەبرێت • بەڵام لە هەموو تێکستە فۆلکلۆری‌یەکانی ژووروودا یا ( بەکۆ ) یا بەکر یا بەکۆی عەوانە ، لای خانیش لابەلا تەنیا لەیەك شوێندا باسی ئەوە کراوە کە دەڵـێن خەڵـکی مەرگەوەر بووە ئیتر بە ( بەکر مەرگەوەڕ ) ناوی نەهاتووە ؟ خۆ بە ( مەرگەوەڕی ) تەنیا ، هەر نا •

**ئەسلاوی دبێن ژ مەرگەوەڕ بوو**
**مەحزا وی بەشەر ، ب شۆڕو شەڕ بوو**

— نووسەر لە شوێنێکدا دەڵێ :

ئەمەك داری : لە هۆڵەکەدا کۆڕ گەرم ئەکەن • تاژدین بەهۆی ئاوگێڕانەوە دێتە لای مەم ) •

کام هۆڵ ؟• دیمەنو ڕووداوی وا لە مەمو زینی خانیدا نی‌یە • واتە نەهۆڵو نە ( ئاوگێڕان ) بەڵکو ئەو ڕووداوەی نووسەر باسی دەکات لە ( شاهنشینی عالی ) ی باخی میردا بووە •

— ( میریش ئەڵێ گەر درۆ بکات لەسەری ئەدات ) ؛ واتە لەسەری ( بەکر ) • لە مەمو زینی خانیدا میر هەڕەشەی‌وای نەکردووە، باسی ئەم دیمەنەش بەتێکڕا لەگەڵ مەمو زینی خانیدا یەك ناگرێتەوە • هەر وەك لەهیچ شوێنێکی مەمو زینـدا بەکـر تەگبیری بـۆ مـیر نەکردووە کە ( ئەوسا تاژدینو براکانی ژەهر خواردوو بکات )• لێرەدا ئەگەر ئەمە قسەی نووسەر بێت یا لە پێشەکی‌یەکەی چاپی هەولێرەوە وەرگیرابێت • ئەوە تەگبیری بەکر ئەوەیە کە بـــە ( زەهری هەلاهیل ) بیانکوژێت ، واتە بەقسەی خۆشو بە وێلو هوشیاری •

— باسی وەسیەتـی (زیـن)یش پەشێویو لەگەڵ خانی نەگونجانـی تێدایە ، مردنی بەکرو ناشتنی لای قاچیانەوە ( واتە قاچی مەمو زین ) هەروا بە ئاسانی نی‌یە ، بەڵکو باسی دیمەنی کوشتنی بەکری دەویست لەلایەن تاژدینەوە •

— نازانم نووسەر ئەمەی لەکوێوە بەزمانی خانی‌یەوە دروست کردووە کە ووتبێتی :

« سەیر ئەوەیە ، هەر گوڵو گوڵزار لەسەر گۆڕەکەی مەمو زین سەوز ئەبێو دڕكو داڵ لەسەر گۆڕەکەی بەکر مەرگەوەڕ ئەڕوێ » •

نا ـ برا : ئەم دیمەنە لای خانی زۆر لەمە قووڵترە • مەمو زین

دەبنە دوو لاولاوو بەرز دەبنەوە ، بەکر دەبێتە کنێرێکی دڕکدارو ( باستری )و تێیان دەئاڵێ ، واتــە ـ لەگۆڕیشدا نایەڵێ یــەك بگرن ـ چونکە خانی ئەو دوو خۆشەویستە لە جیهانی گیانو ئاسمانی ئیفلاتوونیی خۆیدا بەیەك دەگەیێنێت •

— باسی چینایەتی :

« هەموو شت بەخوێ خوێش بەمەعنا » • کە من باسی ئەوەم کردبوو کە خانی هەستی بەوەکردووە کە کومــەڵی کوردەواری چینــی کۆمەڵایەتیی جیاوازی تێدایەو هەستی خانی لەگەڵ هەژارانــە ، ( دەم ڕاست )و ( دەم خوار )ی زۆر دەستگام لێ بەجواب هاتنو کتێبەکەیان بۆ چاپ نەکردم • بەڵام برای نووسەر لێرەدا بــێ ئەوەی هەر بە ناوەرۆکی کتێبەکەدا بزانی من لەو باسە دوواوم تا بچێتەوە سەری ـ خۆی چینو ڕیزی تازەی داناوە • ( مــەمو بەکر )ی بردۆتە ریزی چینی چەوساوەو ژێرەوە • دیسان ( نا ـ برا) : مەم کوڕی دەبیری میرە ، ، واتە ـ هەر لەخۆیانە، هەرچی بەکریشــــە ئـــەوە خــــانی ئـــەوو دەســـتەی دەرگــاوانو پاسەوانو سەرکار» ی تەواو وا دەست نیشان کردووە کەسەگی بەرقاپیی ئاغایانن ، وەسفەکەی خانی تەواو ئەو دەستەیە دەگەیێنێت کە پاش ئەو بە سەدەو نیــۆیك لە ئــەوروپادا بــە ( خلتەی چینی کرێکار ) ناوبراونو مافیان بەسەر بەرهەمهێنانو چینی کرێکارەوە نییــە •

وا بزانم نووسەر نەیتوانیووە تابلۆی تەواوی کێشــەی چینایەتی لەمەموزیندا بدۆزێتەوە • هەر بەوەی (مەم) ی کردوە بە کوڕە هــەژار شیرازەی کاری تێکداوەو لەخەیاڵی خۆیەوە کێشــەیەکی دروســت

چیرۆك

## - ١ -

# که‌ده‌زووله‌ خوێنه‌کان ئه‌چۆڕانه‌وه‌ ..

**( ئه‌مینی میرزا که‌ریم )**

که‌ له‌ شاره‌که‌م دوور بووم وه‌نه‌بێ که‌م‌و زۆر له‌ هه‌واڵ‌و ورده‌ باسی چه‌ند هاوڕێیه‌کی گیانی به‌ گیانیم بێ‌ئاگا بوو بم به‌ڵام نه‌م ده‌زانی که‌ له‌ ناخیاندا چی‌قه‌وماوه‌ ، چی‌گۆڕاوه‌ ، چی له‌ جێی خۆی ماوه‌و نه‌ماوه‌ ، وه‌نه‌بێ هه‌میشه‌ شاره‌که‌م له‌به‌رچاو نه‌بوو‌بێ‌و خه‌ونم پێوه‌ نه‌دیبێ ، به‌ڵام نه‌م‌ده‌زانی ئاخۆ تێرمۆمێتره‌ گه‌وره‌که‌ی ئه‌م شاره‌ به‌رزه‌ له‌ خوارووو ژووررووی سفره‌وه‌ کام ژماره‌ پیشان ده‌دات ؟ !

که‌ جێمهێشت دڵنیابووم هه‌ر بۆی ده‌گه‌ڕێمه‌وه‌ لێشم وون ببوایه‌ به‌ چرای ڕۆنگه‌رچه‌که‌وه‌ به‌ دوای دۆزینه‌وه‌یدا وێڵ ده‌بووم تا ئه‌مدیبه‌وه‌ . بلبله‌ کل ده‌رخواردراوه‌کان له‌ پاڵ گوڵه‌ ڕه‌شه‌کاندا زرته‌ی چاویان ئه‌هات‌و دڵیان پێشی دڵمیان ئه‌دایه‌وه‌و وایان ده‌زانی ئیترو هه‌رگیزاو هه‌رگیز نه‌ ئه‌وان به‌ من‌و نه‌ منیش به‌ ئه‌وان ناگه‌مه‌وه‌ .. ! !

بەرەو لانە فراوانە دێرینەکەم بوومەوە ، هەر کە لە سنوور نزیك کەوتمەوە ، سپیایی لووتکەی پیرەمەگرون ماندوێتی سەفەرە درێژەکەی ئەوسای هێنایەوە پێش دیدەمو دڵم بەوە خۆش کردەوە کەوا هەستم لەگەڵ تێمپۆی(١) سروودی چیاکانی دەورووپشت ئەگونجا لەوەدا کە هەر خۆیان لە دەوری شارەکەم ئەگێڕا ••• بە ناو ڕواڵەتی شـاردا سووڕامەوە ، بەمسەرو ئەو سەری شەقامەکاندا دەورم ئەکردەوە ، کە ماندوو ئەبووم ئانیشکم لەسەر پەرژینـە دەستـکردەکانی بـەر لێواری سۆشەی شەقامەکاندا دادەناو لـە چـاوی کەوێـکی لە شـەڕدا هەناسە سوارەوە لەم خەڵکەم دەنواڕی ، لە هاتوچۆدا ئەوانەی ئەمناسینـەوە زوربەیان قژیان وەك سەری من سپی بوو بوو ••• ڕێبوارە بەوەفاکان ئەو زاتانەی لە خۆیان لەگوڕابوون بە گەرمەوە پێشوازیان ئەکردم ، ئەوانەشی کە لە بە وەفایی مندا ، بە شەرمەزاریەوە ڕوویان وەردەچەرخان بەو لاوە، بە دێوجامەکانی بەریان ئارەقی تەریقیان ئەسڕی‌و ئەسڕیەوە••، لە ڕۆیشتندا بووم پیاوە کورتەبنە بەرچنە بەتاڵە بە کۆڵەکە لە تەکمـدا تەکانی ئەدا ، هەر ئەڕۆیشتین‌و ملمان دەنا ، هەنگاوە کورت کورتەکانی وەها بە خێرایی فڕێ دەدا لەگەڵ لاقە درێژەکانی من دەردەچوو نـە پاش دەکەوت‌و نە پێش ، هەر بەڕێوە بووین ••• ( ـ ئەوەتا شوولـە چنراوەکانی بەرچنەکە ووشك هەڵگەڕاون بوونەتە چیلکە ، لەوە دەچێ لە دەمێ ساڵەوە ترێ‌و هەنجیرو هەڵوژەی تێ نەکرابێت ، داخەکەم بۆ میوەکانی ئەوسا کە بە بەرچنە بە دیاری بۆمان ئەهاتەماڵـەوە ••• ) سەرێکی بەرزکردەوەو تێی نواڕیم ، چاوی چەند جارێك ترووکان‌و وەك شتێك کەوتبێتەوە بیری ، سەری دانەواندەوەو چەند هەنگاوێکی‌تر ڕۆیشت ، ئەمجارە وەستاو قۆڵـی گـرتم‌و منیشی ڕاگـرت ،•• ( ئـەم

ڕووەم لا غەریب نی‌یە وەك لە جێگایەك دیبێتم وایە ••• ) چاکەتێکی فشی بەسەر شەڕواڵێکی پان‌و پۆڕدا لەبەر کردبوو بەسەر کراسە شینە ئاودامانەکەیدا پشتێنێکی قایشی زەردی پانی لە کەمەری جەڕاندبوو بە دوو دڵی‌یەوە لە دەمی دەرچوو •••

— مەرحەبا ••؟
— مەرحەبا خاڵە •••
— ئەرێ ، تۆ کوڕەکەی مام سەعۆل نیت ؟ •
— کام سەعۆل ؟
— سەعۆلی توتنچی ••
— خۆیەتی ••
— ناشێ تۆ هێمن بیت ؟ ! •
— زۆر چاك ئەشێ‌و فەرمووش ••
— ئەمناسیتەوە ؟ •
— دیومیت ••
— کە بەرچنە هەنیرەکانم بۆ ئەهێنان •
— تەواوە بیرم کەوتەوە ••
— چاوم ڕوون بۆوە ••
— دە فەرموو با لەخزمەتتدا بین بۆ ئەم چایخانەیە •
— دەست بە کیسەی خاڵیدا نەکەیت •

لە من جیابۆوە ملی بەرەو زوور نا ، جادەی ئەبڕی ، خۆم کرد بە چایخانەکەدا ، یەك دوو کورسی نەگیرابوون چوومە سەر ئەو کورسی‌یە بەتاڵەی کە لەلای ئەو چوار کەسەوە بوو دووانیانم بەسەر زاری لێ‌ئەناسین ، قسەیان لێ گەرم کردبوو ، بێ دەنگ گوێم گرتبوو،

له باسەکەیان گەیشتم بەڵام دوورو نزیك پەیوەندی بە منەوە نەبوو ٠
له جامخانەی چایخانەکەوە سەیری ئەتوومبیلەکانی دەرەوەم ئەکرد ، ئەوەی زیاتر ڕایکێشام بۆ ئەم تەماشاکردنە ئەو ئەتوومبیلبازانەی لامەوە بوون کە تەنووری باسی ئەتوومبیلو مۆدێلەکانیان گەرم کردبوو ٠٠

— داتسۆن کێشی وا بەلاوە ! ! ٠
— تۆیۆتا له بازاڕ شەش ئەکات ٠٠
— نرخ هەر له بەرزبوونەوە دایە ٠
— مۆسکۆڤیچ هەرزانە ماڵی پیاوی بێدانە ٠ ٠
— ئیتر ناهێنرێت ٠٠
— له بەختی ڕەشی بێ پارەکان ٠
— هەشتی مانگی داهاتوو ڤیات دابەش ئەکەن ٠٠٠

هەر بێدەنگ بووم ، بە پێویستم نەزانی خۆم له قسەکانیان هەڵقوورتێنم ٠٠٠ ( ئەگەر چەند سەد دینارێکم ببوایە بە سلفەو قەرزو قۆڵە مۆسکۆڤیچێکی نیو داشتم ئەکڕی ٠٠٠ ) بە لایانەوە سەیر بوو کە من بەشداری گفتو گۆیەکانیانم نەکردو ناوی هیچ جۆرە ئەتوومبیلێکم نەبرد ، وایان دانابوو کە منیش گیرفانو قاسەم سیخناخی سەفتەی گەلاشینەکان کردووە بۆیە دەروێش لەگەڵمدا دووا ٠٠
— ئەڵێی زەوقی ئەتوومبیلت نییە ؟ !
— مەسەلەی زەوق ؟ ! زەوق هەس ، پووڵ ، پووڵ ٠٠ ؟
ئەمیشو برادەرەکانی بە جۆرێك سەیریان ئەکردم پڕ بوو له پرسیاری ئەوەی چۆن منیش وەکو ئەوان دەوڵەمەند نەبووم ٠٠٠
— چۆن ؟ یانی تۆ پارەت نییە ؟ ٠٠
— بۆ سەیرە ؟ خۆ من وەکو ئێوە نیم ٠٠

— ئیمە چیمانە ؟• هـا ؟ ! •• ە

— ئێوە ••• کاسبیشن و بە هەڵپەشن •••

— وا بڵێ •••• ئەگینا ••

— ئەی ••• من فەرمانبەرێکی ڕووت و قووتم ••

— دە هەر سواری ڕینۆ یانزە (٢) بە •

— نە خانوو ، نە دێ ، خاوەنیان نیم و گرێدەریش خۆی نادا لە قەرەیان بۆ ئەوەی تەعویز وەربگرم و دەوڵەمەندبم •

— کاکۆمان نوقورچی قایم ئەگرێت ! ؟

— ئەڵێم هەشن بە ئارەقی ناوچەوان پەیدایان کردووە

— خاڵۆمان لەم جۆرە ئوتوومبیلانەدا ئەڕشێتەوە ،

— • • • • • • • •

بە هەر چوار لای ناو چایخانەکەدا قەنەفەی درێژ کۆلە دانرابوون ، دوو سێ تاکە کورسی نەبێ بە قەنەفەکانیشەوە پڕ بوو بوونەوە ، هەمــە چیزەیان لەسەر دانیشتبوون ، هەندێکیان وەك مقەبـا ڕوویـــان کردبووە جامخانەکەو سەیری دەرەوەیان ئەکرد ، ژمارەیەکی تریان بــە دۆمینــەو تاوڵەوە خەریك بوون ، ئەوانیکەش وەك چیکەنە دەمیان خستبووە گەڕ ، ئەو قوژبنەی کە لای کووپە ئاوەکە خامۆش بوو ئەو ئەدیبانەی لێ دانیشبوون بە هێمنی قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکـرد یەکێکیـان نەبـێ خۆی لــە بەرامبەرەکەی سوور کردبۆوە ، ئەم هاوڕێ گیانی بە گیانیانــەم لــەوە دەچوون لە ناخیانا چتێك قەومابێ چونکە کە هاتمە چایخانەکەوە لوتفی جارانیان نەما بوو ، بۆیە هەر ڕووشیان نەکرد بەلامەوە ••• ( ئەنجا چ دەربەست دێم ، پێش سەفەرەکەم بە موو لێم جیا نەدەبوونەوە ، سەفەرو

مامەلە سەنگی مەحەکە ... ) وەك مێش میوانم نەبێ یان وەکی گوێزم بۆ بژمێرن هەموویانم فەرامۆش کرد . ئەمویست کات بگاتە سەر ئەو ژمارەیـەی کە ئیتر بـکەومە گەڕانـی پەناو پەسـێرو کۆلانەکانی کەی شارەکەم ، بۆ ئەوەی کاتیش بەرمە سەر خووم دایە خوێندنەوەی ئـەو نووسینانەی کە بە دیوارەکانی ناو چایخانەکەدا هەڵواسرابوون ...

١ ـ پاكو تەمیزبە ..

دڵم وەختەبوو بێتە دەرەوە کە کابـراکەی لـە پشتمەوە دانیشتبوو بەڵغەمێکی فڕێ‌دا ...

٢ـ کە گوڵ نیت دڕکیش مەبە ..

کە روانیمە سەر مـێزی چایچی‌یەکـە ، دڕکـی هێنابووە نـاو ئینجانەکەی ...

٣ ـ چاکە لەگەڵ ناکەس بەچە مەکە ..

( ئەو دڕكو داڵەی من لە پێو بەردەمیاندا دەرمهێنـاو ڕامماڵین‌و تووڕم دان چاکەم کـرد ، پەنجـەی هەنگوینایم خسـتە دەمیانـەوە ، گەستیان ... )

٤ ـ مرۆڤ بە نرخترین سەرمایەیە ..

هەموو ئەوانەی لە چایخانەکەدا بوون هەستان‌و غەڵبە غەڵب پەیدا بوو ، تەنها شەڕواڵ گەچاویەك چووە دەرەوە ..

ـــ ئەها ئەوەتا یەکێکیان پلیشانەوە .

هەر ئەوەندە ووتراو هەموو لە جێگای خۆیان دانیشتنەوە کەس مەبەستی نەبوو بزانێت کێ‌یەو گوناهبار کامیانن ، بەڵام دانیشتوان هەر دەستەی

لای خۆیەوە کەوتنە مقۆ ، مقۆ ..

— ( کورۆنا ) کە بوو ..

— نە .. شۆفەرەکە بوو .

— داتسۆنەکە خۆی پاراست ..

— پیکابەکە شکانیەوە سەری ..

— باوکم شارەکە قەڵەباڵغ بووە ...

سەر شەقامەکە بە ڕێبوار تەنراو کومەڵیان بەست .. لاشەکە دیار نەما ، کاکەی بەرچنە بەشان بێ بەرچنەکەی ئەمدی دڕی بە خەڵکەکەدا تا چووە ناویانەوە ، شەڕواڵ گەچاویەکە هەر لەبەر دەرگاکەوە هاواری کردەوە ..

— ووشەی کچی کاکە مەم بووە بە ژێرەوە ..

کەسیان جووڵەیان بۆ نەکرد ، کە ئەمجارەش ئاوڕم لە شەقامەکە دایەوە ووشەی بریندار بە باوەشی کاکەی بەرچنەوە بوو ئەیهێنایە ناو ئەو ئەتومبیلەی کە لە نزیك چایخانەکەوە وەستابوو خوێن لە برینەکەی ووشەوە فیچقەی ئەکردو ئەپرژا بە جامخانەکەدا ، ژان چووە دڵمەوە وام دەزانی شاریش ژانی پێدا دێت بۆ لە دایك بوونی کۆرپەیەکی وەکو ووشەی دەم بە زەردەخەنەوە .. کە سەرم هەڵبڕیەوەو سەیری شووشەی جامخانەکەم کرد دەزوولە خوێنەکان ئەچۆڕانەوەو نیگارێکی جوانی ئەوتۆیان پێکهێنابوو تا ئێستا لە هیچ ئەتڵەسێکدا بەرچاوم نەکەوتووە ، هەستام لەدیوی ناوەوە بچمە دەرەوەو بە ڕواڵەتی شارەکەما بکەومەوە گەڕان ...

# تارمایی‌یه‌کان

**محه‌مه‌د فه‌ریق حه‌سه‌ن**

به چه‌ند هه‌نگاوێك دوورکه‌وتنه‌وه له یانه‌که‌وه سروه‌ی کزه‌بایه‌ك له‌شی کرژکرد •• دوای هه‌ڵوێسته‌یه‌ك ، پانتۆڵه‌که‌ی گورج کرده‌وه • دوگمه‌ی چاکه‌ته‌که‌ی داخست •• یه‌خه‌ی کراسه‌که‌ی چه‌ند جارێـــك هێناو برد تا بۆینباخه‌که‌ی ڕاست‌کرده‌وه •• ده‌یویست وه‌های نیشمـــان بدات که نه‌یخواردۆته‌وه •• له کۆڵانی یانه‌که ترازاو هه‌نگاوی بۆ سه‌ر پیاده‌ڕه‌وی شه‌قامـه گشتی‌یه‌که هه‌ڵهێنایه‌وه •• خه‌یاڵی مــه‌ی ده‌ماره ماندووه‌کانی له‌شی ده‌هێنایه‌وه یه‌ك •• له دوور ته‌کسی‌یه‌ك ده‌رکه‌وت •• ده‌ستی لێ‌ڕاگرت • به‌ڵام ئه‌و له‌سه‌ر خێرایی خۆی به‌رده‌وام بوو • که لێی ڕه‌ت‌بوو ئه‌وسا زانی‌ی پڕی ڕێبوار بوو •• پاڵی به دارته‌لێکه‌وه داو قنج وه‌ستا •• کزه‌بایه‌ك به یه‌خه‌ی کراس‌و به‌رباخه‌ڵیـدا دزه‌ی کــردو مووه‌کانی سه‌ر سینگی زیت‌بوونه‌وه •• نه‌ختێ به‌ژنـی کووڕکرده‌وه‌و هه‌ردوو ده‌ستی ئاخنی‌یه گیرفانی پانتۆڵه‌که‌یه‌وه •

له هه‌ردوو سه‌ری شه‌قامه‌که‌وه ده‌نگ‌و ڕه‌نگی ئوتومو‌بیل نه‌بوو •• گزه بایه‌کی تووڕه ، کۆمه‌ڵێ کاغه‌زو پووش‌و په‌ڵاشی لوول‌داو به‌ره‌و لای ئه‌م ڕایفڕاند •• له‌گه‌ڵ خۆیـدا سه‌رمـاو ترسی ئاڵانده گیانی ••

لۆرییەکی خاکی لەسەرخۆ شەقامەکەی دەپێوا • لە ئاستی ئەمدا پتر خاوی کردەوە • پلاریکیان تێگرت • خۆی لێ‌کردن بە تووڵبڕ ••

لۆرییەکە ڕەت‌بوو • • • • سەرنجی بەدوایەوە بوو تا لێی ون‌بوو • • چاوەکانی هەڵگلۆفت • شەوەکەی پار ئەم وەختەی کەوتەوە یاد •• ئەم حەلانەبوو •• چاوی لێ‌بوو جەوهەر خۆی کرد بە ماڵا •• ئەوشەوە هێشتا ئەم نەگەیشتبۆوە ماڵی خۆیان ، لۆرییەك لەم ڕەنگ‌و نیشانە هەڵیکوتایە سەری‌و جەوهەریان لە نوێنەکانیدا دەرهێنا •• کە دایکی دەرگای لێ‌کردەوە پێی وت :

— چیت‌کرد نەوزاد ؟!•• جەوهەر شیربراتە !•• چەندم پێ وتی پشت‌مەکەرە ماڵی خۆت•• براکانی بەسەرتەوە ناچن!•• تازەمەگەر سەری‌خۆت بۆ وڵاتێ هەڵگری کەس ناوی نەبیستبێ •

— سەریم کردە بەردەباز !•• دنیا هەروا بووە دایە •• ئەم شارەیش جێ‌ناهێڵم •• کێ دەزانێ منم ؟

ماڵەکەی ئەم لەبەردەمیدا وەستابوو دەرگاکەی کرایەوە • باوەشێ توێکڵە شووتی‌یان هەوادایە بەردەمی‌و زرم دەرگایان داخستەوە• ئەمجارەیش سەرنجی هەردووسەری جادەکەی دایەوە • هیچی وای نەبینی مایەی دڵخۆشی بێ •• کەوتە رێ :« گەڕەکەکەمان تۆ لە کوێی؟• دەوەرە بەم سەعات هەشتە تەکسیت دەست‌نەکەوێ ؟•• بۆ سبەینێش بوارت نادەن لە خەتەکانیشەوە بپەڕیتەوە •• هیچی وەهاشم پێ نی‌یە •• منداڵێك وەك کارە کۆرپە سەرم دەبڕێ •• »

جگەرەیەکی نا بەلێویەوە •• چەرخەکەی لێ نزیك خستەوە ••• تارماییی‌یەك بە بەرچاویدا رابورد •• سەری پێ بڵند کردەوە •••

شەمشەمەکوێرەیەك بەرەو گڵۆپەکەی بەرامبەری باڵەتەپەی‌بوو • • •
جگەرەکەی داگیرساندو ملی ڕێگای گرتەبەر •• هەستی راگرت ، تەقەی
پێڵاوەکانی پۆستاڵ ئاسا دەنگیان دەدایەوە •• لە کۆڵانێکی لای چەپەوە
سەگێك بە پرتاو دەرپەڕی • ڕەش ڕەش وەك عەبا ••• هەتا لەم نزیکتر
دەبۆوە پتر هێواشی دەکردەوە ••• لێی کەوتە گومانەوە : « لەوانەیە
نەهێنگر بێ •• کێ دەڵێ نەخۆش نییە » چاوی بۆ بەرد گێڕا ، نەبوو •
پیلێك هاتە بەرچاوی ••• بۆی چوو •• سەگەکەش بە دەوری ئەمدا
نیوەبازنەیەکی دروست‌کردو بەدەم قروسکەوە کلکی بەناو
گەلێداکردو قلاشتی ••

بە نەفەسێکی قووڵ سەری جگەرەکەی گەشایەوەو چەند پزیسکێکی
لێ‌جیابۆوە • نووسان بە روومەتی‌یەوە • لێرەدا گەیشتە سەری
کۆڵانێك‌و سەرەوژوور بۆوە •• جگەرەکەشی لە دوولێوی ترازاند •
تا هێزی تێدابوو دای بەزەویدا •• چەپکێ پریشکی لێ جیابۆوە •
باکەیش چەند هەنگاوێکی سەرەوخوار تل‌دا ••

کۆڵانەکە تەنگ‌و تاریك‌بوو •• دوو تارمایی وریایان کردەوە
هەناسەیەکی کورتی هەڵکێشا ، دوای نەختێ ئەمجا دایەوە •• سەرنجی‌دا
تارمایی‌یەکان دەجووڵێنەوە • وەکو لەودیو بانیژەکەی بەرامبەریەوە
سەرنجی بدەن وەهابوو •• ئیستێکی کردو کەوتەوە ڕێ •• کە چاك
وردبۆوە ، جووتێ قەل بوون ، لەسەر گوێسوانەی ماڵەکە هەڵنیشتبوون•
دووباڵەتەپەیان کردو ملێکیان هێناوبردو بە ئاوازەکەی خۆیان بۆ یەکیان
سەندەوە ••

ئاوڕێکی دواوەی دایەوە •• دڵی‌گوشرا •• چاوەکانی گلۆفت‌و
ئاوڕەکەی پاتەکردەوە •• ڕوانی وا دوو تارمایی شوێنی کەوتوون ••

« له کوێوه هه‌ڵتۆقین ؟ •• خۆ سه‌ر شه‌قامه‌که زینده‌وه‌ری لێ‌نه‌بوو ! »••

ئاواتی بۆ جووتێ شاباڵ ده‌خواست تاکو پێ‌ی بفڕێته حه‌وشه‌ی ماڵه‌وه •• پێ‌ی هه‌ڵگرت دووای چه‌ند ته‌کانێك به‌ تیله‌ی چاو سه‌رنجی دواوه‌ی دا، ڕوانیی ئه‌وانیش بێ‌هه‌ڵده‌گرن •• خاوی کرده‌وه ••• هه‌مدیس ئاوڕی دایه‌وه ، ڕوانیی ئه‌وانیش خاویان کرده‌وه ••

ده‌نگه ده‌نگێك گوێ‌ی زرنگانده‌وه •• جارێك له‌سه‌ر پاژنه‌ی پێ به‌ده‌وری خۆیدا سووڕا ، هیچی نه‌دیت • به‌ڵام ده‌نگه ده‌نگه‌که تاده‌هات لێ‌ی نزیك ده‌بۆوه •• نه‌ده‌چۆوه سه‌ری داخۆ هی چ گیاندارێکه •• سه‌ری بۆ ئاسمان هه‌ڵبڕی ، ڕیزێکی درێژ قازو قوڵینگ کۆچیان ده‌کرد•• سه‌رنجی به دوایانه‌وه بوو •• زوو له‌چاو وون‌بوون‌و ده‌نگیشیان نه‌ما ••

مانگ له‌ژێر په‌رده‌ی هه‌وره‌وه سه‌رهه‌ڵێنا •• ئاهێکی تێکه‌ڕا •• هێنده‌ی نه‌خایاند دیتی مانگه‌که وورده وورده ڕه‌نگ‌و ڕووی جه‌وهه‌ر ده‌گرێ •• ئه‌وه‌تا په‌نجه‌ی شایه‌تمانی بۆ درێژ ده‌کات •• که نیشانه‌ی تاوانبارکردنه •

« له‌گه‌ڵ تۆمه نه‌وزادی سپڵه •• بۆ وات لێ‌کردم ؟ •• خۆ من سه‌رم له‌ڕێتانا بوو •• خاکی به‌ڕپێ‌بووم •• بۆ له‌ده‌مته‌وه دام •• ده‌ته‌وێ که‌للەسه‌رم بکه‌یته به‌رده‌بازو به‌سه‌ریدا بپه‌ڕیته‌وه ؟ • ڕاوه‌سته ، بزانه هاوڕێکانم چۆن تۆڵه‌ت لێ‌ده‌که‌نه‌وه •• لێ‌ده‌که‌نه‌وه »••

په‌ڵه‌یه‌ك هه‌وری ڕه‌ش په‌چه‌ی به مانگ پۆشی‌و کۆڵانه‌که‌ی نوقمی تاریکی‌کرد •• نه‌وزاد زاری ووشك‌بوو ئاوڕێکی به‌په‌له‌ی دایه‌وه •• جووته تارماییه‌که به‌رده‌اوێژێك لێوه‌ی دووربوون ••• ئه‌مجاره‌یان لێ‌ی عه‌یان بوو که دوو زه‌لامن ، بۆیه ته‌واو دڵی گوشرا •• ته‌کانی‌دا

بەڵام باکەیش بەرەو دواوە پاڵی پێوەدەنایەوە •• نەوزاد تادەهات شەکەت دەبوو • قاچەکانی بەیەکدا دەهاتن‌و قاپاوێژیان دەکرد •

× × ×

ئێستا گەیشتۆتە سیلەی کۆڵانەکەیان •• دەرگایەك ، دووان ، سیان ، سەری چوارەمیان ماڵی خۆیانە •• بەژمارە چوارەم ماڵی کۆڵانە ، بە مەزندەش هەر پەنجا هەنگاوێك دەبێ •• بەڵام وەکوتر ، نیوانی سیلەی کۆڵانەکەو دەرگای حەوشەکەیان میانەی بوون‌و نەبوونە ••

لەوێوە ئاوڕێکی دایەوە • بە دوایەوە بوون •• وەکو ملی بەگیر وەستابێ ئاوڕدانەوەکەی تەواو بە گران بۆ ئەنجامدرا •• بەڵام چاوەکانی وەکو فلاشی وێنەگرێك ئەوەندەیان بە بەرەوە مابوو بتوانن هەناسەیەك لە تەمەنی شەوەزەنگەکە داڕنن • نەوزادیش لەوە حاڵی ببێ کە تا چ ڕادەیەك ژیانی لە مەترسیدایە•• چونکە ئەوەندەیان تفاق پێبوو ، نەك ئەمێکی دەست بە تاڵ، بەڵکو دەیانی وەکو ئەمیان پێ بێ‌گیان دەکرد •

تەواو شەکەت بوو •• دەمە داچەقێی پێ‌کەوت • خۆی وەکو گەماڵە خوێرییەك هاتە بەرچاو ، لەسەر هێلکەدزین خڕ دەرگایان لەسەر داخستبێ ، سەگ بەحەسارێکی چاکیان پێ‌کردبێ •• زمانی بە باشی لەزاریدا نەدەگەڕا •• بە دوو سێ تەقەللا • دەستی بۆ بەر باخەڵی برد • وەکو جاران بەدەستی‌یەوە نەهات • ئەمجارەش هەوڵی‌دایەوە ، بێ‌هوودە بوو • زانی‌ی تا چ ڕادەیەك پەشۆکاوە •• ئەگینا ئەو بە دوو پەنجە جگەرەیەکی لە پاکەتەکەی باخەڵی دەردەهێناو تەنانەت هاوڕێکانی سەر مێزەکەی پێیان • نەدەزانی لە کوێوە دەیانهێنێ •• چنگی بە باخەڵیدا کرد • پاکەتەکەی بەدەستەوە هات •

٨

جگەرەیەکی نا بە لێویەوە•• بە هەردوو دەست، گیرفانی پانتۆڵ،راستو چەپ• هی چاکەت راستو چەپ•• ناوەوە••• هەمووی پشکنی•• دوای دۆش دامانێك لە گیرفانی کراسەکەیدا چەرخەکەی دەرهێنا • لەبەردێك هەڵەنگووت • بە چەند هەوڵێك خۆی گرتەوە •• پەنجەکەڵەی لە ماشەی چەرخەکە گیرکرد •• دەستی چەپی بۆ زمانەی گڕەکە کردە سوپەر •• مژێکی لێدا •• لەوەدابوو هەردوو گووپی بدەنەوە لەیەك •• تامێکـی نامۆ سەری زمانی چووزاندەوەو جگەرەکەیش کوژایەوە •• چەنـــد جارێکی دی هەوڵی دایەوە ، بێئەنجام بوو •• ئەمجا پشتی کردە باکـەو ماڵی خۆیان •• پشتی کردە ماڵی خۆیانو یەکی بە باڵای کێوێك لەبـەر روانینیدا قوتبوونەوە • تەنیا گوریسێك لێوەی دوربوون • چەرخەکەی داگیرساندەوە •• تامی جغارەکەش نامۆتر دەبوو •• زانیی بەرەواژ بە لێویەوە ناوە • هەڵیگێڕایەوە سەر لە نوێ ئاگریدایـەوە •• لە نێـوان گڕی چەرخەکەوە هەردووکیـانی بەدیکرد • وەکـو دوو شـاخەوانی کۆڵبەکۆڵ راستو چەپیان لێگرتبوو ••لەسەر شانیانەوە دوو گوێچکەی ئاسنین سامیان دەنارد •

دەیویست پێهەڵگرێ ••• کەچی لاقەکانی وەکو لەسەر تایمێك چەسپکرابن ، نەیدەتوانی هەنگاوێك لەوە بەرینتر بنێ •• لە دۆخێکدا بوو ، خەونە ئاڵۆزەکانی سەردەمی منداڵیی بیر دەخـستەوە • پشـیلە کێوییەکی کەللە زلی بەڵەك پێست ، چاو کووژەکەیی ، شوێنی دەکەوت• ها لێرە ها لەوێ ، بە ناو بیشەڵانو تووناوتووندا دەیفڕاند •• لەپڕێکدا قاچەکانی جەمامو زاری دەبەسترا •• ئەوجا نەزمانی دەما ها بکات ، نـە قاچی دەما ڕابکات •• لەوەدابوو قەپاڵی پشیلەی تایین بگاتە قولـە پێیو خەبەری دەبۆوە •

ئێستاش ، نــە ئــەوەتا گیانی بچن‌و نــە ئــەوەتا وازی لێ بهێنن •
سێیەرئاسا بە شوێنی‌یەوەن ••

دەنگــێکی بارێك‌و درێژی چــاوەڕوان نەکراو هاتــە بــەرگوێ •
لەگەڵیــدا دڵی بازی‌داو لەوەدابوو لەمــووتی‌یــەوە بێتــە دەرەوە • بــە
جووڵانەوەیەکی خۆنەویستانە بەلای دەنگەکــەدا بای‌دایــەوە •• چاوی
وردکردەوە وا گوربەیەك لێی زیت‌دەبێتەوە •• چاوەکانی وەکو دووکەلا
شووشە دەبریسکێنەوە • سەرپشتی کووڕ •• خۆی کرژ کردبوو ، وەك
لە بۆسەی جرجێکدابێ • نەوزاد زیاتر ملی چەقی‌یە ناو شانی‌یەوە •

پشتی کردەوە ماڵی خۆیان • دیتی بەرەبەرە لێی نزیك دەبنەوە ••
سمێڵ قەوی‌یەکەیان لای‌ڕاست‌و باریکەلەکەیان لای چەپی لێ گرتبوو ••
لەبەر تروسکــایی گلۆپی کۆڵانەکەیــان دەیتــوانی ڕوخســاریان لێــك
جوێ بکاتەوە • هێجگار ئەوە کۆڵەی کوتابوو دەنگیان لێوە نەدەهات •••
ئەم بێ‌دەنگی‌یە بە سامە وەکو مۆتەکە چۆکی دادابووە ســەر کۆڵــەی
ســینگی •

ویستی گوڕ بداتە خۆی‌و ئەو چەند هەنگاوە بە گورجی ببڕێ ••
زۆری لەلاقەکانی کرد •• بێ هوودە بوو ••

بایــەکی تووڕە تەزوویــەکی ســاردی دابەڕوویــدا • جغارەکــەی
کەشــــایەوەو پزیسکەکــانی بــەرەورووی بوونــەوە • کۆکــەیــەکــی
تاسێنەر بەربینی گرت •• جغارەکەی تووڕهەڵدا•• کۆکەکەی خاوبۆوە••
هێزی دایە بەر خۆی •• ئەوانیش پێ‌یان هەلگــرت •• وەکــو بیانــەوێ
مریشکێك بگرن سمێل قەوی‌یەکەیــان لای ڕاســتەوە ئامبــازی دەبــوو
دەیویست تەنگاوی بکات ، باریکەلەکەشیان لای چەپــەوە باوەشــی بــۆ
کردبۆوە •• خەیاڵاتێکی خراپ بە مێشکیدا گوزەری کرد • « ئێستا تەواو
لەوە دڵنیــام کە بــراکانی جەوهــەرن ، بــە نیازی تــۆڵە هاتــوون •••
خۆیانن •• »

لەو ساتەدا ، تەواو هەستی بە بێدەرەتانیو تەنیا باڵی،دەکرد •• وای دەزانی لە بیابانێکدا گیری خواردووە ، هەرچی ژیان‌بێ تێیدا نی‌یە ••• تەنانەت حوشتر خۆریشی تێدا نەڕواوە •• تا چاو بڕبکات دەریایەك لمی ڕووتە •••

بۆ یەکەم پێپلکە پێی هەڵهێنایەوە • دوو پلیکانەی‌ترو دەستی دەگاتە دەرگاکەیان •• لێی دەدات •• ئەو جۆرە لێدانەی خۆیان لەسەری ڕێکەوتوون •• دایکیشی بە پڕتاو بە دەنگی‌یەوە دێ :

– لەگەڵ تۆمە کوڕم نەوزاد ، ڕووسیات کردین •• چۆن دڵت هێنای وات لە جەوهەر کرد •• شیربرات بوو •• کوڕی گەڕەك بوو ••

– جەوهەر بەردەبازەو بەسەریدا دەپەڕمەوە ! • دوای ئەوەش کێ گومانی بۆ من دەچێ ؟

– وا مەڵێ •• لەم شارەدا بە قەدەر نووکە دەرزی‌یەك شت وون نابێ • تاوانت کرد ••

کەوتە خۆی •• هەموو هێزی کۆکردەوەو شاڵاوی بۆ دەرگاکە برد •• لەسەریەك کەوتە کوتانی •• کاتێکی زانی بە جووتە لەسەر پلیکانەکانن‌و لایان لێ‌بڕیوە •• بە هاڵاوی هەناسەیان بناگوێی گەرم داهات •• ئەبڵەق بوو •• وای هەست‌کرد تاریکە شەوەکەی لێ خەستتر دەبێو شەوەکە هێندەی عەبایەکی ماوەتەوە •• سینگی توندبوو • وەك بەندی دڵی دەرکێشن بێ‌هێزو لەرزۆك ، لەبەر دەستیاندا ووشك وەستا•• ئەوەی زیاتر پرزەی ئەمی بڕیبوو بێ‌دەنگی‌یەکەیان بوو •• وەك بەرخی ژێر چەقۆی قەساب لە تێڕامانی دەستو چەقۆکە پتر چاری نەمابوو •••

دیسان لەسەر یەك کەوتەوە کوتانی دەرگاکە •• بەڵام دایکی بەدەنگی‌یەوە نەهات •• وەك ئەمشەو هەموو لایەك تەنانەت دایکیشی ،

لەسەر مەحف‌بوونەوەی ڕێك كەوتبن وەهابوو • ترووسكەی لەچوار كەناری بەدی نەدەكرد • ( پشت مەكەرە ماڵی خۆت •• براكانی جەوهەر •• مەگەر سەری خۆت بۆ وڵاتێ هەڵگری •• تاوانت كرد •• تاوان •• »

وەك شەوگەرد بە دیوارەكەدا هەڵزنا •• بەڵام هەریەكە لاقێكیان گرت‌و بەریان‌دایە خوارەوە •• لەسەر گازەرای پشت كەوت •• وەكو دوو حووچ بە ژوور سەری‌یەوە ڕووان •• دوای كەمێك هەریەكە وا دەستیان دایە پەنجەتووتەیەكی‌و ڕاستیان كردەوە •• ئەمجارەیان وەك پشیلەیەك تەنگاو كرابێ خۆی كرژكردو بە هەردوو چنگی پەلاماری سەرو مێزەرەكەیانی داو یەك بەخۆی هاواری كرد :

– من براكەتانم نەكوشتووە !

كڵاوو مێزەری هەردووكیانی بەدەستەوە هات ئەبڵەق وەستا ••• هەرچاوێكی بە قەدەر هەڵووژەیەك دەرپەڕی •• كەوتە لێوەلەرێ ، كاتێ سەرنجی دا ، بە جووتە كەسی ترنین خۆی نەبێ !! •• هەردوو ڕووەكەیش دەمامك بوون •• نەوزاد لە ناوەڕاستدا • دوانەكەی دی كە هەر خۆی بوون لەملاو لەولایەوە وەستابوون ••

بەرەبەرە هێزی لەبەر بڕا •• نوشتایەوە •• دوو قەد بوو •• سێ‌قەد بوو •• لەسەر پلیكانەكان رەهێڵ‌بوو ••

لەودیویشەوە دایكی تەواو پەشۆكابوو ••• چونكە تاكو ئێستا ئەو جۆرە لەدەرگادانەی نەبیستبوو ! •• وەكو تریش نەوزادی كوڕی هێشتا بە دەرەوە بوو •••

# ئەو لە بازنەیەکی داخراودا

**زاهیر ئەحمەد سەوز**

پەیمان سەرسنگی بە وێنەی جوانەمەرگ نەخشاندبوو کراسە ڕەشە ئاو دامانەکەی‌و باریک‌و بنێسی‌و ڕەنگ زەردیی نیشانەی‌خەمێکی گەورە بوون لەگەڵ ئەوەشدا هێزو پتەوی لە قولایی چاوەکانیا ئەدرەوشانەوە •

بە هات‌و چۆی سەر گۆڕەکەی جوانەمەرگ کڵپەی ئازارەکانی دەروونی خەفە ئەکرد • گلێنەی چاوەکانی تێ‌ئەبڕی ، بارستایی گڵی سەر گۆڕەکەی ئەبووە کاغەزێکی سلوفین‌و لە ژێریا جوانەمەرگی بەدی ئەکرد • بەم دیمەنە برینی کۆن‌و نوێی قەتماغەی ئەبەست • کاتێ پەیمان بە خۆیدا ئەهاتەوە تیشکی خۆر ستوونی ئەیدا لە تەوقی سەری• دوو لێوی ووشک‌بووی ئەنایە سەر کێلەکەی ژوور سەری‌و ماڵ ئاوایی لەگۆڕەکەی‌و گۆڕستانەکە ئەکرد• سەری بە سەر سنگیا شۆڕ ئەکردەوە، چمکی عەباکەی دڕک‌و داڵی گۆڕستانەکەی ڕائەماڵی • جڵەوی خەیاڵی بزڕکاوی شل‌ئەکرد • لە زۆر لاوە قوناوی بیری ئاڵۆزی هەڵگرت هیچی دەست‌گیر نەبوو هەر چمکێکی ژیانی ڕابوردووی هەڵ‌ئەدایەوەو ئەکەوتە گەمە کردن لە تەکیا برینەکانی ئەهێنایەوە سوێ‌و ناچار دەست بەرداریان ئەبوو •

لە دامێنی گردەکەدا عەشاماتێکی گەورەی بەدی کرد • ئەم دیدارە بەلایەوە سەیر نەبوو چونکە ئاشنایەتی لە تەکیانا پەیداکردبوو لە بن دار ئەرخەوانێکدا خۆی مەڵاس دا • لە ناو عەشاماتەکەدا ( ئەو )ی بەدفەڕو ئێسك قورسی بەدی کرد ، هەر بەبینینی شریخەی قین لە چاوەکانیا کڵپەی سەند بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە •

( ـ ماڵی ناچاریم بە قوڕگرت کە بە پیاوی وات ئەناسێنێ ) •

سەرتاڵی بیری کۆنی هەڵکردەوە • ئەو ڕۆژەی هاتەوە یاد کە لەبەر دەمیا دۆش داما لە ئەنجامدا بێ سێ و دوو پەنجەی تاوانی بۆ درێژکرد ( ئەو )یش ئەو کاتە بە دوای چارە سەرێکدا ئەگەڕا • بەڵام ئەو چارەسەرە لە قوللەی قافا گیری خواردبوو • کاتێکیش دەست گیری بوو بووە مارەکەی شێخ ئومەرو ئالایە ملی زیاتر خۆی بۆ بیری ئەو ڕۆژەی شل کرد • وەك هەورە برووسکەی بەهار قاقاکەی (ئەو) لە گوێ ی دا زرنگایەوە ووشەکانیشی وەك دووپشك بە جگەری یەوە دان کە ووتی :ـ

ـــ هەر ئەبێت بکرێت • ئەمانە خەوو خۆراکیان لێ حەرام کردووم

هێدی هێدی قسەکانی هاتەوە یاد کە ووتی :

(ـ کوێخا عەزیز نەخشەی لەناو بردنیانی بۆ کێشاوم ) نەخشەکەی کوێخا عەزیز دەست لە ملانی پیلانەکانی ( ئەو) بوو •

پێش ئەوەی کار ئەنجام وەدەست بێنێ • لە لوتکەی بەرزی ئاواتەکانیەوە هەڵدێرایە کەندەلانی هەزار بە هەزاری توونی پاباوە • بێ دەستەلاتی ، جیهانی پان و بەرینی لێ کردبووە چەرمە چۆلەکە •

( ئەو ) پارچە کاغەزە زەردە هەڵگەڕاوەکەی لە باخەڵی دەرهێنا دایە بەر تیشکی سەرنجی ووشەکانی کاڵ ببوونەوە • لە ناو پارچە کاغەزەکەدا کۆمەڵێك دەرمانی ڕەنگاوڕەنگ بەندکرابوون •

( ئەو ) ڕووی دەمی کردە پەیمان •

ــ ئا ئەمەیە دەرمانی دەردیان •

( الفاتحەی ) مەلا شریتی خەیاڵی پساند لە پەنا کێلەکەداو لە ژێر دار ئەرخەوانەکەدا خۆی دۆزییەوە •

هێدی هێدی ( ئەو ) لە پەیمان نزیك ئەبووەوە لاقەکانی بە دوای خۆیدا ئەخشاند وەك مێردەزمە لە ژوور سەری ڕاوەستا • پەیمان هەردوو چاوی تێبڕیو دایە بەر سەرنجی گاڵتەجاڕی ( ئەو )یش بە سەرشوڕییەکەوە دەستیبرد بۆ باخەڵی هەر ئەو پارچە کاغەزی زەرد هەڵگەڕاوی دەرهێناو یەکالای کردەوە •

( پەیمان ) دەرمانە ڕەنگاو ڕەنگەکانی هاتەوە یاد • لەگەڵ یادکردنەوەی دەرمانەکاندا سەرنجی پەشۆکاویو چرچو لوێچی لاملو دەموچاوی ئەدا •

ڕازی قسەی بۆ پەیمان دابەست ( پەیمان ) یش بە ناچاری گوێی بۆ قسەکانی شلکرد • لەگەڵ گوێ شلکردنەکەدا بە تیشکی سەرنج لەشی ئەنجن ئەنجنو دەرزیاژن ئەکرد •

( ئەو ) درێژەی بە قسەکانی دا ، وەك گوێز بۆ پەیمان بژمێرێ هیچی لێحاڵی نەبوو •

دووا قسەی ( ئەو ) وەك هەزار پێ ، چنگی لە مێشکی پەیمان گیرکرد ( ئەو )یش بە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ هەر ئەو قسەیەی دووپات کردەوەو ووتی :ــ

ــ دەرمانەکان ماڵیان وێرانکردم •

پەیمان خۆی لە قسەکە گێلکرد موچڕکەی خۆشی سەری

هەڵدا ، بزە باڵی کێشا بە سەر لێوەکانیا • لە دڵی خۆیدا ووتی •

( ـ ئەمە تۆیت وا زەلیل‌و داماو دان بەم کارەدا دەنێیت • )

پەیمان هەستایە سەر پێ‌و چاوەتیژەکانی تێبڕی •

ـــ کام دەرمان ؟!

( ئەو ) مۆڕەیەکی لە پەیمان‌کردو بە ڕوویا هەڵشاخا •

ـــ ئەڵێیت کام دەرمان ؟! ئەو دەرمانانەی لە ناو ئەم کاغەزەدا بـــوون

بزەیەکی نوێ لە ناخی پەیماناا سەری هەڵدا ، چاکتر گوێی بـۆ

قسەکانی شل‌کرد ، پەیمان بە هەلی‌زانی‌و پرسیارێکی دا بە گوێیدا

ـــ بۆ ماڵیان وێران کردی ؟!

هەردووکیان نقەیان لێ‌بڕا • دوای هەڵڕوانینێکی بێ‌هوودە یەکتریان

بەجێ هێشت •

پەیمان شەقاوی خێراتری نا ، بە پەلـە خـۆی کرد بە ژووردا

ئاوڕێکی لە وێنەکەی جوانەمەرگ دایەوە ، وەك مزگێنی‌یەکی گەورەی

بداتێ ڕووی تێ‌کرد فرمێسکێکی قەتیس‌ماو لە پێڵوەکانی خۆی رزگارکردو

بە سەر ڕوومەتیا بەرەو خوار بووەوە • کۆرپەکەی چمکی کراسەکەی

ڕاکێشا •

ـــ دایە بۆ ئەگریت ؟

پەیمان بە پشتی دەستی فرمێسکەکەی سڕی بە هێواشی ووتی :

ـــ کوڕم لەخۆشیدا •

کۆرپەکە زیاتر پیا هەڵزناو سەری بەرزکردەوە •

شکاند • ئەوەی کە زیاتر پێوەی خەریك‌بوو دەرمانەکان حەمە لاو سەری

ـــ باوکم یەتەوە •

پەیمان دانەوی‌یەوەو باوەشی پیاکرد • چاوی بڕی‌یە چاوەکانی‌و دوو لێوی ووشك هەڵاتووی‌کردەوە •

— کەس نی‌یە ئەم تەلیسمەم بۆ بشکێنێ •

ترپەیەك ملی بە پەیمان وەرچەرخان بەرەو دەرگای ژوورەکە حەمە لاو خۆی کرد بەژوورا • پەیمان بە دیداری شادبوو •

چونکە ماوەیەك بوو سەری لێ‌نەدابوون بەرەو ڕووی حەمە لاو ڕۆیشت • حەمە لاویش بە زەردەخەنەوە ڕووی‌کردە پەیمان •

— کام تەلیسم پەیمان خان ؟ !

پەیمان هەناسەیەکی هەڵکێشا • ڕووی وەرچەرخانەوە بەلای جوانەمەرگ‌دا و ووتی •

— ئێستا لە گۆڕستان گەڕامەوە • تەرمی یەکێکیان بەڕێ‌ئەکرد (ئەو)یش‌یان لەگەڵ بوو •

زەردەخەنەیەك لەسەر لێوەکانی حەمە لاو نەخشاو ووتی :

— ئاگادارم • درێژەی بە قسەکانی‌داو وەك بارانی گەواڵە هەوری بەهار قسەی داڕشت :

پەیمانیش زیاتر گوێی بۆ قسەکانی شل‌ئەکرد •

قسەکانی حەمە لاو بوونە ئاوو تینوێتی چەند ڕۆژەی پەیمانیان شکاند • ئەوەی کە زیاتر پێوەی خەریك‌بوو (دەرمانەکان) بوون• حەمەلاو سەری ئازایەتی بۆ پەیمان لارکردەوە خەریك‌بوو لە دەرگاکە ئاوا بێ • بانگێکی لێ‌کرد •

— بەسەرهاتی دەرمانەکان چی‌یە ؟

حەمە لاو خۆی گورج‌کردەوە هێزی دایە خۆی‌و ووتی •

— زەماوەندەکەی پارت لە بیرە ؟
پەیمان سەرێکی بۆ لەقاندو هەردوو چاوی تێبڕی •
حەمە لاو درێژەی بە قسەکانیدا •

— ( ئەو )و تاقمەکەی زۆر خۆریانکرد • لە ئەنجامدا ئینتەلایـــان کردبوو پیزەش لە دەرمانەکانی کردبوو بە قوڕگیانا •
( پەیمان ) بە پەرۆشەوە ووتی :ـ

— ئەی ( ئەو ) لێ نەخوارد ؟ !
حەمە لاو بە پێکەنینەوە •

— پیلان پیلانی ( ئەوە )و پیزەش دەرمانەکانی لێتێك چوبوو •
لەم کاتەدا جارچی دەنگی لێبەرز کردەوە •
ئەمانیش متەقیان لە خۆیان بڕیو گوێیان بـۆ شلکـرد هـاواری ئەکـرد •

— ئەوەی ترسی لـە خۆیەتـیو لـە دەرمانەکانـی ، دەسـتی پیزەی خواردووە • بەزووترین کات بگاتە خەستەخانە •
پەیمان بە قاقایەك پەردەی گوێی حەمە لاوی لەراندەوە لەگـەڵ قاقاکەدا ووتی :

( ئەی نەت بیستووە ئەوەی چاڵ بـۆ خەڵـکی هەڵـکەنێ خـۆی تێئەکەوێ • )

چیرۆك

# ســـــەفەربەر

سەلام مەنمی

تاقیکردنەوەی ساڵت کۆتایی پێهێنا ، بەرەو گوندەکەت خۆت پێچایەوە •• مسوەدەی چیرۆکی سەفەربەرت نایــە گـیرفانت ، ئـــەو چیرۆکەی دەمێك بوو لە خولیای نووسینیا بووی‌و ڕووداوێکی گرنگ بوولە ڕابوردووی گوندەکەتا •• سواری ئۆتۆمۆبیل بووی ، لە شــــار دەرچوویت ، چیرۆکەکەت لە گیرفانت دەرهێناو ویستت سەیرێــکی بکەیت •• بەلام بـیرت لە گـێژاوی ڕۆژانی تاقیکردنــەوەدا ونبوو ، مێشکت وەك بەردی ئاسیاو ئەخولایەوە ، ناچار ناتەوە گیرفانت ووتت :ـ مەگەر لە گوندەکە بیهێنمە قۆڵە ، گەیشتیتە نزیك گوندەکە : (لێرەدا چەند جار کارو بەرخت لەوەڕانووەو زاوماتکردن ، دایکت لەگەڵ دەستە کیژان‌و ژنانی گوندەکەدا بۆ مەڕ دۆشین ئەهاتن ، جار جاریش دەستیان ئەگرت ، حەمە شوانیش شمشاڵی بۆ لێئەدان ، کە ماندوویش ئەبوو ، بە شیرەوە ئەکەوتە پارو گلاندن •• ئەوەیش زەوییەکەمانە ، چەند جار باوکم گاوخانی تیا بڕیتەوە ، چەند جار بەرگاییم تیاکردی • )

چوویتەوە ئاوایی •• پشووت گرت ، مسوەدەی چیرۆکەکەت ،

لەبەردەمتا داناو دەستت نایە ژێر چەناگەت ، کەوتیتە بیر کردنەوە ، دیمەنی ئەو پرسیارانەت هاتەوە یاد کە خاڵە ( ڕەجەب ) لە باپیرتی کردو ووتـی : ـ

ــ وەزعی ئەم گوندەی ئێمە لە سەفەربەردا چۆن بووە ••؟

ــ ئەم گوندە ، ئێستا سەری ساماڵـەو پەلیهاویشتـووەو خۆی لـــە دانگەی کوڕەکاژاو داوە ، درەختەکانیشی لەگەڵ چیاکەدا کۆڵەکە ئەدەنو هەر یەکە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگی پۆشیوە ـ سەفەربەر وەك بایە قوژ بە دەنگی ناسازی گرمانی بە سەریاو سەری بـە هـەور گرت ، دنیای بە کەوە ڕۆژ لێکرد ، مۆریانو چنگنە وەك تەتەڵە میران ، دابوویانە لاشەی مرۆڤ بۆنی لاشەی مرۆڤ ساتە ڕێیەك ئەڕۆیشت لەمانەیش جگەربڕتر زەفتیەی عوسمانلی بوو •• هاتن دڵڕەقانە دارستانو زەویەکانیان سووتان کانیاوەکانیان کاولکرد، بەڵام چۆن دارستانێك ، لە ئێستا جوانتر گوندەکەیان ڕازانبۆوە •• خاڵە قسەکەی پێبڕیو ووتی :

ــ بۆچی سووتانیان ••؟

ــ ئەیانووت ئەم گوندە سەرپێچی لـە کارمـان ئەکاتو ڕەدیفیـان زۆرە ، • •

ــ ڕەدیف چییە • • ؟

ــ هەڵاتوو •

ــ بۆ کوێ چوون ••؟

ــ هەریەکە بە لایەکا ئاوارەبووین •

خاڵە سەری بۆ لەقاندو ووتی :ـ بەڵێ •

باپیرت کەوتەوە قسەکردن :

— مرۆڤ کەوتە قاچو قووچ ، هەر شەوەی چەند ماڵو کولێن ئەبررا ، دز لەو ڕۆژەدا ، تێر بوو ، سامی هەبوو ژیان کەوتە سەر شیرێژو قاوتو گوڵەبڕە ••

— ئەوجا ئەتتوانی دزی بکەیت •• ؟

— من دزیم نە ئەکرد •• بەڵام مامم جار جار خۆی وونئەکرد ، لەولاوە بە چارۆکەیەك گوڵەبڕەوە ئەهاتەوە لە یادمە ، جارێ ، دوو تا خەراری هێنایەوە ، مچەی دراوسێمان لێی کڕیو شەرواڵێکی لێدروست کردنو لە پێی هەڵکێشا •• زەبرو زەنگی سەفەر بەر بەرباد بوو •• بەرچاومان ڕوونبۆوە ، ئەوەی مایەوە خۆی پێنەگیرا ، بە پیادەیی بە شاخو هەردا بە بیابانو دۆڵا هاتینەوە بۆ گوندەکە •• بەڵام بە داخەوە زۆر کەس سەرینەهێنایە دواوەو کەوتنە ناو گۆمی لیخنی سەفەربەرەوە ، خنکان ، بە تایبەتی مام فلامورز ـ ئەگەر ئەو بمایە من چ حەددێکم هەبوو باسی سەفەربەر بکەم ، هەموو شتێك لایەق بەو بوو ، بچووکترین کارەساتی لە بیر نە ئەچۆوە ••تۆیش دەستت دایە قەڵەمەکەتو ئەو قسانەت بە هەوێنی چیرۆکەکەت کردو کۆتاییت پێ هێنا •••

## ئاگاداری

ئەو بابەتەی بە ناوونیشانی « ئەم چیرۆکانە » لە لاپەڕە ( ٤٢ )دا بلاوکراوەتەوە ، پێشەکیی چیرۆکەکانە کە لە لاپەڕە ( ١٠٤ )ەوە دەستپێئەکەن ، بە هەڵە پەڕیوەتە ئەو شوێنەوە • تکایە خوێندەواران ئاگاداری ئەوە بن •

نووسەری کورد

# منو هەر چواریان

م ٠ ع ٠ م

( یەك ) :ـ

ڕەنجبەری کوێخا رەجەب بوو ، دەیزانی زۆر شت هەیەو نایزانێ ٠ نازانێ بۆ دانیشتووانی ئاواییەکەی لەم رۆژانەدا توڕەنو لە هیچە منالەکانیان دارکاری دەکەنو بە خۆڕایی دلی ژنەکانیان دەڕەنجێنن ٠

« یەك » لەبەر خۆیەوە دەیووت :

ــ ( شتێ بووە ٠٠ ڕەنگە کەسێکی گەورە مردبێ ٠٠ ) دلگیر بوو ، نەیدەزانی چۆن خۆی بخلافێنێو دلخۆشی خۆی بداتەوە ، گەلێ جار گەمەی لەگەل تاقە بەرخەکەیدا دەکرد ٠٠٠ ئەمسال کوێخا وەکو سالانی پێشوو هانی ئیش کردنی ناداتو پێی دەلێ :

– کوڕم ئەزیەتی خۆت مەدە بێسودە ٠٠ کوڕم بێسودە ٠٠
لەم قسانەی کوێخا سەری سوڕدەماو لەبەر خۆیەوە دەیووت ٠

ـ ( ئەمە کوێخا نییە وا مالی خۆی مفت دەبەخشێ ٠ سالانەکەم دەدات٠٠ هانی تەمەلیشم دەدات ٠٠ ئەمسال هەر هیچم بۆی نەکردووە ٠٠٠ شتێ هەر بووە ٠٠ )

«یەك» لەبەر بێئیشی زۆربەی رۆژگاری لەگەڵ تاقە بەرخەکەیداو لە هەردەکاندا بەسەر دەبرد •• ئێوارەیێك بەرەو ئاوایی دەهاتەوە ، لەپڕ لەسەر ملەکەدا هەڵوێستەیێکی کردو پەلاماری بەرخەکەیداو گرتییە باوەشەوە • « یەك » بە وردی سەرنجی دەدایە ئەو دوو هێڵە هاوتەریبەی بەر پێی‌و لەبەر خۆیەوە دەیووت •

ـ ( ئەڵێی جێ خشکەی دوو ئەژدیهای عاشقەو ماشقەن ) •

کە بە وردی تێی راما زانی جێی تایەی لۆرییەو چەن لۆرییەك هاتووەتە ئاواییەکە ••

( یەك گەلێ دڵی بەرەنجبەرییەکەی دەکرایەوە ، ئەگەرچی لەم دێیەدا لە دایك نەبووەو نازانێ لە کوێ لە دایك بووەو دایك‌و باوکی خۆی نەبینیوە ، چاوی کردووەتەوە لەناو فەرەنجییە کۆنێکدا خۆی بینیوەو رەنجبەری کوێخا رەجەبە •• « یەك » ئەوەندە ئەم دێیەی خۆش دەوێ تا بە بارە مەڕەکان‌و بە حیلکە ماینەکانی دەناسێ ، گەورەو بچوکی دێیەکەیش « یەك » یان خۆشی دەوێ » •

توند بەرخەکەی گوشییە سنگیەوەو بەوردی گوێی هەڵخست‌و پێکەنی •

ـ ( رەنگە کوێخا رەجەب مێگەلە مەڕێکی تازەی کڕیبێ •• رەنگە بووبێ بە شوانکارەی گەورە پیاوێك •• چاکە ئیتر بێئیش نابم‌و شوانی دەکەم •• )

زەڕینی کەرێك مەزەنەکەی تێکدا ••

ـ ( رەنگە کوێخا میوانی هاتبێ )

ورده ورده له مله‌که‌وه بۆ ناو ئاوایی داکشا ، به‌رخه‌که هه‌ر به باوه‌شی‌یه‌وه بوو .. هه‌ندێ مناڵه ورتکه‌ی بۆر بۆری بینی ، هه‌ندێ زه‌لامی بینی وه‌کو مێروله به‌یه‌کا ده‌هاتن‌و ده‌چوون‌و قسه‌یان ده‌کرد .. «یه‌ك» تێنه‌ده‌گه‌یشت چی ده‌ڵێن .. حه‌په‌سا .. لێی کۆبوونه‌وه ، سه‌ری لێ تێکچوو ، لێیان کرده هه‌ڵلا ، پاشه‌و پاش کشایه‌وه ، خۆی خسته نێوان هه‌ردوو هێڵه راکشاوه‌که‌ی سه‌ر زه‌وی‌یه‌که‌ی به‌ر پێی ، به‌ره‌و خوار ، به‌راکردن ملی‌نا . هه‌ناسه برکێ‌و ترس ته‌نگی پێ‌هه‌ڵچنی هه‌ندێ جار هه‌ڵوێسته‌یێکی ده‌کرد ، نه‌ك بۆ ئه‌وه‌ی هیلاکیه‌که‌ی ده‌رکات‌و بحه‌سێته‌وه ، به‌ڵکو به‌دوای دوو هێڵه‌که‌دا ده‌گه‌ڕا که له هه‌ندێ شوێنی زه‌وی‌یه ره‌قه‌کاندا ون ببوو .. تا ئه‌یدۆزییه‌وه‌و خۆی ده‌کوتایه نێوان دوو هێڵه‌که‌وه شپرزه‌یی ئه‌ژنۆی بێ‌هێز ده‌کرد ، ئه‌وه‌نده رایکرد هه‌ر نه‌گه‌یشته ئه‌و سه‌ری دوو هێڵه‌که .. سه‌ره‌ڕای هیلاکیه‌که‌ی هه‌ر بێ‌ئومید نه‌بوو ، زیاتر ته‌کانی ده‌دایه به‌ر خۆی له‌پڕ «یه‌ك» به‌سه‌ر چۆك‌و به‌ده‌ما که‌وت ، شه‌پۆلی ده‌نگی ته‌قه‌یێك په‌رده‌ی گوێیه‌کانی ماچ کردو بووه دوا ده‌نگێ که (یه‌ك) بیبیستێ ، به‌رخه‌که‌ی باوه‌شی په‌ڕی . (یه‌ك) بێده‌نگ بو ، له نێوانی هه‌ردوو هێڵه‌که‌دا وه‌کو خه‌وی لێکه‌وتبێ ئاوها راکشا بوو ..

کاتێ خوێنه‌که‌ی «یه‌ك» هێڵێکی باریکی دروست کردو جه‌مسه‌ری هه‌ردوو هێڵه هاوته‌ریبه‌که‌ی به یه‌ك گه‌یاند ، چه‌قۆیێکی تیژ خوێنی به‌رخه‌که‌ی رژانه سه‌ر خوێنه‌که‌ی «یه‌ك» .

**( دوو ) : —**

خه‌جێ له‌بری خوێن درابوو به فه‌تحوڵلا بۆ باواخونی له گه‌ڵ «دوو»ی شوبرا بچکۆلانه‌که‌یدا ، ده‌ڕواته‌وه بۆ دێیه‌که‌یان ، پاش

چەند ڕۆژێ دەگەڕێنەوە •• سەرتاسەری ڕێی گەڕانەوەیان خەجێ شۆخیی لەگەڵ «دوو»ی شوبرایدا دەکاتو پێی دەڵێ •

ـــ بەم زووانە دەبیت بە مام •• مامە •

«دوو» لە خۆشیا خەریك بوو پەڕو پۆ دەرکات لەبەر خۆیەوە دەیووت :

ـ ( من هێشتا نازانم سیغار بپێچمەوە •• دەستم ناتوانێ دەستەدوو بگرێ ، چۆن دەبم بە مامە •• ؟ )

خەجێو «دوو» بەدەم قسەکردنەوە گەیشتنە ناو ئاواییەکەی خۆیان•• گەلێ هیلاك بوون، ئارەق بەر چاویانی گرتبوو •• کەسێکی ناسیاویان نەبینی •• سەریان سوڕما •• دڵنیابوون ڕێگەیان ون نەکردووە • ئەوەی دەیبینن نەك نایناسن بەڵکو لێنیحاڵی نابن شپرزەبوون •• لێیان کۆبوونەوە «دوو» ڕایکرد ، دەرباز بوو ، خەجێ جێما •• !!

«دوو» ئێستا لەشارە گەورەکەی نزیکی دێیەکەیان بۆیاغچییەتی دەکات لە چایخانەکاندا دەنوێت نە دەزانێ دایكو باوکیو فەتحوڵلا ـی برایو خەڵکی ئاواییەکەی لە کوێنو بۆ کوێ براون• نەبیریشیان دەکات• تەنها بیرکردنەوەی ـ کە شەوو ڕۆژ ئازاری دەدات ـ ئەمەیە •

ـ ( بشێ کاتێ برازاکەم بدینم لە زمانم تێبگات ؟؟ )

( سێ ) :ـ

تەمەنی ٣٠ ساڵە لەم ڕۆژانەدا گەلێ تووڕەو مۆنە ، بە پێچەوانەی زۆربەی خەڵکەکەی دەورو بەرییەوە ، تارمایی ترسێکی نادیاری وەکو مۆتەکەیێك چۆکی ناوەتە سەر سنگی هەموو ئێوارەیێك وەکو مناڵ وڕك دەگرێو بە باوکی دەڵێ :

ــ تاوێروتاشە بەرد خوێنی تیا نەهێشتووم ، لە ڕۆژێکا دەیان جـار پێم هەڵدەکەوێ ، هەموو نینۆکەکانم وەرین •• دڕکو داڵی ئـەم ناوچەیە وەکو سوژن دەچەقنە دەرونمەوە ناتوانم ــ ئەم زەوی‌یە ــ بکێڵم •• باوە •• بابە •• تکا ئەکەم با بگەڕێینەوە بۆ هەرێمەکەی خۆمان •• « زەوی نادۆزرێتەوە ، زەوی خوای خاوەنییەتی » بـا بگەڕێینەوە ، ئەم دێیە بەجێ بێڵین ••

باوکی «سێ» ڕۆژگارو تاقی‌کردنەوەکانی بـۆی سەلماندبووکە : ناشێ ••• تا سەر نییە هەر ئەبێ ••• با ئەمڕۆ ••• سبەی ••• با چەنساڵێکی دیش ••• بەڵام هەر ئەبێ •••!! دەیشیزانی کوڕەکەی ڕاست دەکات ••

«سێ» ئەوەندە بیانووی گرت ، ئەوەنـدە لە خـواردن‌و قسەکردن تۆرا ، تا باوکی بەزەیی پیا هاتەوە ، هەر بۆ دڵدانەوەی کوڕەکەی خەونە ئاڵۆزەکانی خۆی بۆ دووبارە دەکردەوە :

ــ « ئا •• کوڕم •• لە خەوما کۆترێـك ئەیگـمان ، هەراسانـی کردم تێگەیشتم ، دەیەوێ هێلکەکانیشی بگوازێتەوە •• لەم خەونەمـدا ئەوەندە بەزەییم بەم کۆترەدا هاتەوە ، دەنگی هەنیسکی گریانـم تێکەڵ بە گمەگمە بەسۆزەکەی‌بوو • هێلانەکەیم دۆزییەوە ، هەردوو هێلکەکانییم نایە سەر مشت ، نەمدەزانی بە چ زمانێ تێبگەیێنم کە منیش بێ دەسەڵاتم •• ناچارم •• هەزاران کیلۆمەتر ڕێگا بە خۆڕایی شڕەو ڕەکانیمان گواستووەتەوە بـۆ ئەم دێیە • • ناتوانـم سەرپێچی بکەم دووچاری ئاوارەبی‌و دەربەدەری دەبم •• ئێستا گەر سەرپێچیش بکەم‌و یاخی بم چۆن دەگەمـەوە جێیـەکەی خـۆم ؟ ؟

هێلکەکان لە دەستم بەر بوونەوە، شکان، دوو زەڕنەقوتەی زیندوو لە نێو قاوغی هێلکەکاندا سەریان دەرهێنا ... « ئاخ نازانم کەی ئەم دوو زەڕنەقوتەیە فێری فڕین دەبن ؟ »

کوڕم باوەڕ بکە چەن ڕۆژێ پاش ئەوەی لێرەدا نیشتەجێ کراین ، هەموو شەوێ هەر کە بە ئاستەم چاو لە یەك دەنێم کۆترەکە بە دەنگی زیکەزیکی بێچووەکانییەوە دێو دان دەکا بە قوڕگیاناو دەگمێنێو دەگمێنێو دەگمێنێ ... »

«سێ» هەمیشە دەیووت :

— باوە .. بێسوودە .. خەون گێڕانەوە بێسوودە .. بەزەیی پیاهاتنەوە بێسوودە بێسوود ..
ڕق لە دەروونی «سێ»دا تەقییەوە .. ڕێگای گرتە بەر ..
نە خۆی .. نە باوکی .. نە کەسێ دەزانێ ڕوو لە کوێ دەکاتو بۆ کوێ دەڕوات .

( چوار ) :-

بیستو چوار ساڵانە .. بێوەژنە ، ساڵو نیوێکە مێردەکەی لەناو چووە ، جگە لەوەی ئاو و هەوا گەرمەکەی ئەم ناوچەیە جووانییەکەی شێواندووە ، شەونخونیش لاوازی کردووە ، بێکەسیش زیاتر ڕەگی بێئومێدی لە دەروونیا چەقاندووە .. هەر شەوە لە باخەڵی چەند کەسێکی نەناسدا دەنوێ .

( چوار ) :-

شەرم ناکات .. بەتایبەتی لە هاوزمانەکانی .. کردەوەکانی

هەزاران هەزار پرسیارە•• بێدەنگیەکەی ناقە وەڵامە ، هەموو خاوەن هەستو بەزەییەکان دەتاسێنێ •• «چوار» هەرگیز بیر لە گەڕانەوە ناکاتەوە ••

« چوار » بێدەنگە ••

« چوار ) قایلە

بێدەنگە •••

قایلە ••• بێدەنگە ••

× × ×

خوێنەکەی « یەك » ، پرسیارەکەی « دوو » وێڵییەکەی « سێ » قایل بوونو بێدەنگیەکەی « چوار » کەرەسەی چیرۆکێ یا شیعرێکی میهرەجانی، وشەی « بەزیوە » •••

پێشەکی ویستم لە چیرۆکێکدا زیندوویان کەمەوە :

خوێنەکەی « یەك » دەوری تەنیم ، چووە نێو پێنوسەکەمەوە ، دێڕەکانی سوور دەکرد ، دەیقیژاندو لێم ڕادەپەڕیو ڕووبەڕووم دەوەستاو پەنجەی بۆ درێژ دەکردم •• دووبارە بە دێڕەکاندا دەهاتمەوە ، نووکی پێنووسەکەم دەچەقاندە رووومەتمەوە ، خوێنەکەی « یەك » بە دەنگی بەرز دەینرکاند :

ــ کەی ••• ئەم هێڵە سوورانەی وا دەیکێشی لەسەر ئەم لاپەڕە سپییانەدا لە درێژایی ئەو دوو هێڵەیە کە تایەی لۆرییەکان چاپی کردووەتە سەر زەوی دێیەکەمان •• کەی ؟•• کێ دەڵێ هێڵە هاوتەریبەکان بە یەك ناگەن ؟ »

خوێنی بەرخەکەی « یەك » وەکو ڕووبارێکی تووڕە بەردەمی

پێنوسەکەمی گرتبوو تا چاو بڕکات ئاسمان‌و زەویی بیرکردنەوەمی سوور کردبوو•• ناچار بووم پێنوسەکەم بە دەوری ئەو چەند دێڕەدا بسوڕێنمەوەو کۆێژی ئازاری دێڕە سورەکانم دەکرد ، کەچی زیاتر لێم رادەپەڕین‌و زیاتر پەنجەی ناڕەزاییان بۆ درێژ دەکردم ، داوای خوێنی خۆیان دەکرد تێکەڵی خوێنەکەیانی کەم •••

پرسیارەکەی « دوو » سەرتاسەری پەڕەکانی مێژووی پێ هەڵدامەوە، هەموو فەرهەنگەکانم پشکنی نەمتوانی وەڵامێ وەدەس بێنم •• هەر کە دەمویست بیکەم بە پاڵەوانێکی سەرەکی ، کەچی پرسیارەکەی پەنای لێدەگرتم‌و لە گۆشەی دێڕێکدا دەنگی بەرز دەکردەوەو دەیووت :

— هەرگیز لە نوێنی دێڕێکدا•• لەناو پەرتوکێکدا نانووم •• نامەوێ خەون بە وەڵامەوە ببینم ، یاخیم لەوەی بنووسرێم •• وەڵامم دەوێ •• »

هەر کە هەوڵی وڵامدانەوەم دەدا پرسیارەکەی « دوو » هەزاران پرسیاری دی‌ی لێ‌هەڵدەوەری •• هەموو دنیای لێم دەکردە پرسیار •• خۆمی لە خۆم دەکردە پرسیار ••

« سێ » لە هەر لەنگەرێکدا رامدەگرت ئۆقرەی نەدەگرت ، لەگەڵ هەر دێڕێکدا لەنگەرەکانی پێدەگۆڕیم •• شارەو شارو بیابان‌و بیابان دەریاو دەریا کەوتە دوای •

من‌و « چوار » و پێنووسەکەم نەمانتوانی لەنگەرێکی بێ‌ژان بەدی بکەین « سێ » هەر ملی‌دەناو دەڕۆیشت ، ئارامی نەدەگرت •

من‌وپێنوسەکەم ، ماندوو شەکەت لە نێو برینەکانی ئەم زەوییەدا بووینە ژان‌و ئۆقرەی ناچاریمان تێدا گرت •

« چـوار » م کرده نموونـەی خاوێنی ، بێدەنگ‌و قایل بـوو ، کردمە نموونـەی داوێن پیسـی هەر بێـدەنـگ‌و قایل‌بـوو ، کردمـە سەرچاوەی هەموو گوناەو گومڕاهییەك هەر بێدەنگ‌و قایل‌بوو کوشتم هەر بێدەنگ‌و قایل‌بوو •• ژیانمەوە هەر بێدەنگ بوو کە دەستم لە سەر پێنووسەکەم هەڵدەگرت‌و کۆتاییم بە چیرۆکەکەم دەهێنا « چوار » م لێ رادەپەڕی‌و لێم دەهاتە دەنگ‌و لە قایـل بوون‌و بێدەنگیەکـەم ناڕازی دەبوو •• ناچار دەمنووسی •• دەمنووسی •• دەمنووسی •• کە هیـلاك دەبووم ناڕازی دەبوو •• قایل نەدەبوو قایل‌و بێدەنگ بم •• بەزییم •• لە پێناوی راستییێکدا راستییێکی ترم کوشت ••

ئەم پاڵەوانانەم سەریان شۆڕ نەکرد بۆ چیرۆکەکەم •• بـە رقـەوە دوو هێڵی راست‌و چەپم بە سەرتاسەری چیرۆکەکەمـدا هێناو پـەنام بـردە بەر شیعر ••

( یـەك ) : ـ

رێی لێ تەنیم •• قایل نەدەبوو بەزمانی پێنووسەکەم دەنگ هەڵبڕم بە زمانێ دەینرکاند :

کێش‌و قافیە لەبەر دەمیا دەلەرزین •
بەزمانێ دەینرکاند •• دارو بەردو ئاوو ئاسمانی دەگریان •
« چ رۆخ‌و کەناری شیعرێ دەتوانێ ـ ئەم ـ
خوێنەی ـ یەك ـ بگرێتە ئامێز
چ بۆشاییێکی ئەم گەردوونە ؟
چ رەشەبای شیعرێ دەتوانێ

ئەم خوێنە بگرێتە خۆی‌و لە ئاستی رەنگ‌و قەوارەی دڵـۆپێکیـا دۆش دامێنێ‌و ببەزێ •

بێهودە لە نێو ئەم گێژەنە مەستەدا خول بخواتەوە چ شیعرێ ••؟

( دوو ) : ـ

پرسیاری زۆرە
ناتوانێ دەریان برێ ••
وەڵامی هیچیان نازانێ
کەسێکیش نی‌یە وەڵامێکی دروستی بداتەوە
کەس نی‌یە تێبگەیێنێت
بۆ ئەم زەوی‌یە پیرە مەستانە سوڕدەخواتەوە ؟
بۆ ئەم شەوە تاریکە •• ئەم ڕەشەبایە ئەم گەمی‌یە
بێ ڕێیــە
تێکڕا خۆراکی زەمێکی ئەم مێژووە نەوسنەی ئەم تافە
ئاڵـۆزەن ؟
کەس نی‌یە «دوو» بلاوێنێتەوە ••
«دوو» ناگرێت •• خەوی نایێت !!

( سێ ) : ـ

دەڕوات •• هەر دەڕوات
ڕێگا ڕقەبەڕقێی لەگەڵدا دەکات
بە توڕەییەوە هەنگاوەکانی دەچەقێنێتە سەر
ئاوڵەو دومەڵە پیسەکانی ئەم زەوی‌یە بۆرە
هەر دەڕوات
توڕەیە •• پێدەکەنێ ، نازانێ بۆ کوێ دەڕوات
توڕەیە •• دەگرێت و سەروڕیشی بەرداوەتەوە

پێویستی بە ئاو نی‌یە
پێویستی بە هەتاو نی‌یە
هەموو ڕۆژێ ، لەگەڵ هەنگاو هەڵهێنانیا
هەتاو لە دەرونیا هەڵدێ‌و ئاوا دەبێ !

( سێ ) : ـ

دەڕوات‌و ڕێگاش ڕقە بە ڕقێ‌ی لەگەڵدا دەکات
هەر دەڕوات‌و هەر دەڕوات

( چوار ) : ـ

ئازارەکانی ئەم سەردەمەی گرتووەتە کۆڵ
هەموو شەوێ لە نوێنی نە ناسێکدا لەگەڵ تاسەو حەزی مەرگی
خۆیا دەنوێ ••
شەرم •• سەرزەنشتی برسی‌یەتیەکەی دەکات‌و ڕقەکانی دەوروژێنێ
چوار •• بێدەنگە ••
ئاوێنەکانی بە توڕەییەوە دەشکێنێ
لە چاوانی منالانی برسیدا خۆی دەبینێ
پرچەکەی لە ڕەنگدانەوەی سەرابی ئەم زەوی‌یە
تینوو نەزۆکەی ـ ئەم تافەدا ـ شانەدەکات ••
پێناکەنێ •• بێدەنگە •• بەزەیی بە هەموو کەسێکی برسیدا دێتەوە
وەکو بەفر بە هەناسەی ئاوارەکـان ـ هەموو ـ نـاخی دەتوێتـەوە
تینی غەریبی دەیکاتە هەڵم
بێ‌ئومێدی بەرەو ئاسمانێکی بەرینی پەژارەیی ئەیفڕێنێ
بروسکەو چەخماغەی ژانەکانی دەیکاتە باران‌و دەیبارێنێ

«چوار» بارانەو دەبارێو هەر دەبارێ
«چوار» گوناهە•• ستەمە•• مەرگە•• ژانە•• دەبارێو هەر دەبارێ
گوناهەکانمان دەشواتەوە
دەبارێ •• هەر دەبارێ

نەخێر دیسانەوە بێسوودە بەرقەوە دوو هێڵی ڕاستو چەپم بەسەر ئەم شیعرەیشدا هێنا •• پەنام بردە بەر رنگ تا لە تابلۆیەکدا جێیان بکەمەوە ••

چوار چێوەیێکم دەست نەکەوت سەرتاسەری ئازارەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمەی گرتبێتە ئامێز ••

«ئەگەر تەنها ژانێ •• ژانی تەنها کەسێ •• کەسێکی ئاوارەو برسی لە چوارچێوەدا گەمارۆ بدرێ، ئەبێ ئەو چوارچێوەیە لە بەرینی ئەم زەمینەدا بێت ••»

بڕیارم دا تابلۆیێکی بێسنور بکێشم، هیچ جڵەوێ تاوێ سەرکێشی ژانەکانی رانەگرێ •• لە تێکەڵ کردنی هەموو ڕەنگەکاندا ڕەنگێکی بۆرم چنگ کەوت، کردمە ئەو زەوی‌یە پیرو کرمۆڵەی بەر پێی «سێ»و ڕەنگێکی سووری تۆخم کرد، بەرگو داممالیە جەستەیەوە •• «سێ»ی سوورو ڕێگای بۆر وەکو ئاسمانێکی ژانگرتووی وەرزێکی تۆراوی یاساکانی سروشتی پێوەند کراو وەبەر چاو دەکەوت ••

ڕەنگم دەست نەکەوت بگونجێ لە گەڵ مەرگی «یەك»دا شێتانە زەردو سوورو سەوزم تێکەڵ کردو دەریایێکم نەخشاند «یەك»م کردە شەپۆلە وروژاوەکانی، هەر دوو باسکی یەکم کردە دوو ڕووباری هاوتەریبو بێکۆتایی •• لە ڕەنگی سپی گونکێکم دروست کرد لە شێوەی بەرخەکەی یەکدا لەبەر پێی سێدا ڕامگرت •

«چوار»م کرده هەتاو نەمزانی لە چ ڕەنگێکدا دروستی بکەم ڕەش‌و سپیم تاقی کردەوە •• سڕیمەوە •• سەرلە نوێ دووبارە سڕیمەوە • • پاشان لە هەمان ڕەنگی سپی‌و ڕەش هەتاوێکی گەلێ گەورەم دروست کرد بەشێکی سپی‌و بەشەکەی تری ڕەشی قەترانی •• تیشکەکانیم لە شێوەی بارانی فرمێسکدا ئەبارانە سەر ڕەشەبای هەناسەی پرسیارەکانی « دوو » ـ کە ناڕازی بوو لە نێو ڕەنگدا پێوەن بکرێ ـ ناچار بۆشاییەکی بێ ڕەنگم کردە « دوو » بە وردی سەیری ئەم تابلۆیەم کرد • هەمان دوو هێڵی ڕاست‌و چەپ بەرقێکی زیاتر خۆی چەسپاندە سەر ئەم تابلۆیە •

« ئەگەر کەلێنێ نەبێ ژانی لێوە دەرباز بکرێ ڕەنگە ئەو چوار چێوەیەـ کە ژانی لە ئامێز ناوە ـ ببێت بە ژان •• هەست دەکەم دڵی ژانگرتووم لەم‌زەوی‌یە بەرینترە • یا من‌و دڵم ژان بەشێکی تەواوکەری ئەم گەردوونە پەککەوتەیەین ـ ) •

× × ×

« یەك »و « دوو » و « سێ » و « چوار » •

من‌و هەر چواریان

من‌و هەموو هاو دەردەکانیان •• من‌و شەوگاری چڵکن‌و تەنیایی‌و
پێنووسەکەم

من‌و هەموو تارماییەکانیان بۆ کەلێنێ وێڵ‌بووین

بە سەماکردن نەمانتوانی کەس حاڵی بکەین

بە گریان نەمانتوانی کەسێ تێبگەینین

خوێنەکەی « یەك » لەسەر لاپەڕەکانی بەردەستم سەمای دەکرد

دەگریا •• پرسیارەکەی « دوو » زۆربەی وشەکانی پێم کوێر کردەوەو لە ناو دێرەکانی بەر دەستما رمبازێی دەکرد ••

« سێ ) رێی ئاوارەییەکەی گواستبووەوە بۆ نێوانی خەتە بەیەکـا چووەکانی لاپەرەکانی بەردەستم •• « چوار » ژانی گواستبووەوە نێـو پێنوسەکەمەوە •••

پێنووسەکەم سەمای دەکرد •• دەستم سەمای دەکرد ، چـاوم ، سەرم ، سەمایان دەکرد •

تەنهاییەکـەم بـۆ ئارەزووەکانم سـەمای دەکرد •• رۆشـنایی گلۆپەکەی ژورەکەم بۆ تاریکیـەکەی دەرێ سـەمای دەکـرد •• لـە دەرەوەی ژورەکەمدا باران بۆ زەوی سەمایدەکرد ••

بێزار بووم لە بێزاری •• بۆ ؟ چۆن ناتوانم ئەم چوار کەسە بکەم بە چیرۆك •• بە شیعر •• بە تابلۆ •• بە سەما ؟ دەرەوەی ژوورەکـەم باران نم نم ••

جار جار بە خوڕ دەبارێ •• چەخماغەیێکی زل لەپەنجەرەکەوە خۆی کردە ژورەکەمـەوە نالـەی دەنگی هـەورە بروسـکەیێك دلـی داخورپاندم نالەیێکیتر •• یەکێتر •• یەکێتریش •

هەلسامە سەر پێ کاغەزەکانی بەردەستم درانـد ، لە پەنجـەرەی ژوورەکەمەوە فرێیانم دایە دەرەوە ، لە ژێـر بارانەکـەدا پارچـەکانی سەمایان دەکرد •

کاتێ تەمەنی چەخماغەکان درێژەیان
دەکێشا ، بریارمدا سەمای
پارچە کاغەزەکان بکەم بە
چ ی ر ۆ ك ێ

# دیمەنێکی •• یادداشتی چەند ساڵە

**- زەریـا -**

« ••• ئایا بە پێوانـەی هونەرو تەکنیك ،
ئەم چەند لاپەڕەیە بە چیرۆك دادەنێین ؟ •
یا لە خانەی چ بابەتە چیرۆکێکدا جێیـان
دەکەینەوە؟ ئەگەر بشچنە خانەی یادداشتو
تەرجومەی حاڵەوە ، هەر چەند لاپەڕەیەکی
بەنـرخو وێنەیـەکی تـاکی کامێرایـە ••
دیمەنێك لە ژیـانو بینینی نووسـەرو زۆر
کەسو زۆر کاتو شوێن دەگێڕێتەوە •••

**« نووسەری کورد »**

چوار سەعات بە ڕێدا ڕۆیشتبووین کە نزیك ئەو گوندە گەیشتین بە چەند برادەرێكو هەندێ پێکەوە ڕاوەستاین ئێمـە ڕێـگای زینـۆی ئەستێرەکانمان لە بەرەو ئەوان بەوێدا هاتوون • هەر کە منو بێستوونی برادەرمیان دی بـەرەو ئەو ڕێیـە ئەڕۆیـن •• پێش هـەواڵپرسینی خۆمانو ئـەو برادەرانـەی لەلایانـەوە هاتووینو ئەمـان دەچن بۆ دیدەنی‌یان ، یەکسەر بە سەرسووڕمانێکەوە ڕوویان تێ‌کردینو هـەر چواریان ویستیان پێکەوە هەر ئەو قسەیە بکەن : ئەوە بەم بەفرە بـۆ کوێ ئەچن ! بەم پاش نیوەڕۆ درەنگە ! قەت ناهێڵین بـەرەو زینۆو پڵنگان بڕۆن چونکە مردن نەبێ هیچی‌تر نە ئەبینن‌و نە ئەگەنە کەس ، بابگەڕێینەوە بۆ ئەم گوندە نزیکەو ئەمشەو لەوێ بن هەتا سبەینێ بزانن چۆن دەبێ •

ڕۆژەکە •• ڕۆژێکێ زستانی زۆر تووش بوو • بەفر کڵۆ کڵۆ دەهاتە خوارەوە ، دەمێ ساڵ بوو سەرمای وامان نەدیبوو بەفرەکە بـە جۆرێك ئەهاتە خوارەوە کە ئەو دۆڵو چیا گەردن‌کەش‌و بڵندانەیان وا سپی کردبوو کە هیچی ترت نە ئەدی • ئەو چیا بەرزو سەختانەی ئـەو ناوچەیە پارچەیەکی گەورە دارستان‌قەدپاڵو لوتکەیانی داپۆشیوە ، کەچی نە ئەو دارستانە چڕەو نە دەیان دۆڵی گەورە گەورەی نێوانیان نوختەیەکی ڕەشی‌یان پێوە دیار نەمابوو لەبەر بـەفرو زوربەی دۆڵەکان بـە هەرەسی بەفری سەرەوە پڕ بوو بوونەوە ••

گوێمان نەدایە قسەی برادەرەکانمان • ملی ڕێگامان گرتەبەرو بـە هیوای ئەوەی سوود لە جێ پێی ئەوان وەرگرین لە هاتنە خوارەوەیان‌دا، بەرەو ژوور بوینەوە ••

بەفرەکە بەرە بەرە زیادی ئەکردو هەتا سەریش ئەکەوتین هەوای سارد زیاتر سەری لووت‌و دەم‌و چاومانی دەتەزان ، جامانەکانمان کرد بە لەچك‌و هەر بەرەو ژوور ئەبووینەوە •

بێستوون ووتی : من لە هەموو ژیانما نەترساوم ، بەڵام زۆر لەم بەفرە ئەترسم • ترسی ئەوەشم زۆرە ڕێگا وون‌بکەین ، باوەڕیشم نی‌یە بەم عەسرە درەنگە کەسی‌تر هەبێ بەم ڕێگە سامناکەدا بڕوات •

من نەك بڵێم لە بێستوون ئازاتر یا شارەزاتر بووم ، بەڵام من خۆم ئەمزانی بۆچی بەو ڕۆژە ناخۆشە ئەبێ ئەو ڕێگایە ببڕین • بۆیە بـە پێکەنینێکی دروست‌کراوەوە پێم‌ووت : کاکە برا من‌و تۆ هەر هیچ نەبێ دەیان جار بەم ڕێ‌یەدا هاتووچومان کردووەو شارەزای دارو بەردی ئـەم شاخانەین ، ئەی هەموو جارێك نائێین چاویشمان ببەستنەوەو بەرەڵـلای ئەو ڕێگایەمان بکەن وون نابین •• ئەمەم لە کاتێکدا ووت کە ئیتر بەرە بەرە

جێ پێی برادەرەکانمان نە ئەدۆزی‌یەوە • بەفری زۆر پەیتا پەیتا هەموو جێ‌پێ‌وڕێچکەو ڕێگای بێ شوێنەوار کردبوو •

ناخۆشتر لە سەرماو لە ترسی ڕێ وونکردن ، ئەو تەمە زۆرە بوو کە وای کردبوو چەند مەترێك زیاتر لـە بەردەم خۆتـەوە نەبینی ••

هەرچەند هەنگاوێکیش ئەڕۆیشتین قاچمان بە ناو قووڵایی ئەو بەفرە زۆرەدا ڕۆ ئەچوو ، تاکێك لەو پێڵاوە لاستیکە بێ ناو کەف‌و بێ‌بەرگـی ناوەوەیەمان لە ناو بەفرەکەدا لە پێ دائەکەنراو ناچار ئەبووین ئەژنـــۆ دادەین‌و قۆڵ درێژبکەین بۆ دەرهێنانەوەی‌و لەپێ‌کردنەوەی هەتا چەند هەنگاوێکی‌تر • لەو کاتانەشدا کە دانەئەکەنران پڕ ئەبوون لە بەفرو تۆزە تۆزە بە هۆی جووڵانی پێوە بەفرەکە لە ناویا ئەتوایەوەو دەبووە بەفراوێکی ساردو سەری پەنجەکانی ئەتەزان ، هـەتا بـەرە بەرە گـەرمایی قـاچ بەفراوەکەی لە ناوپێڵاوە لاستیکەکەدا شیلەتێن ئەکردو ئەگەر بەفری تازە خۆی نەکردایەوە بەناویا کەمێك لەناخۆشی‌ی ڕێگاکە بەو گەرمایی‌یە کەم‌دەبووەوە •

هەرچۆنێك بوو بەسەر سەختی‌و بەرزی‌ی ڕێگاکەدا زاڵ بووین‌و نزیك لووتکەی زینۆ بووینەوە •• لام وابێ هەر سەد مەترێکمان مابوو بگەینە سەرەوە کە لە بەردەممانەوە شتێك ڕەشی ئەکردەوە ، هەر یەکەمان گومانی شتێکی‌لێ‌ئـەکرد ، بە پـەلەو بێ‌دەنگی گەیشـتینە سـەری ، تەماشائەکەین لاوێکە ڕاست لەسەر پشت کەوتووە ،شەرواڵێك‌و کراسێك‌و قەمسەڵەیەکی لەبەردایەو ئەویش سـەرمای ئەو دیوی شـاخـەکە کـە پێ‌ی‌داهاتبوو جامانەی پێ‌کردبووە لەچك ، دەستی ڕاستی خستبووە سەر مەمکی چەپی‌و هەناسەی لێ‌بڕابوو •• هەر چەند جووڵانمان بێ‌سـوود بوو •• دیاربوو ماندوویی زۆرو سەرما لەو دیوەوە تەنگیان پێ‌هەڵچنیوەو

که گەیشتۆتە سەر لووتکەی زینۆش ئەو با توندە هەمیشەیی‌یەی لەوێدا هەیە داوێتی لە گیانی ئارەق‌کردووەوەی‌و ڕەقی‌کردوتەوەو لەگەڵ ئازاری دڵیدا دووا هەناسەی لەسەر ئەو چیا مەزنە دابوو •

بێستوون بە چاوێکی پڕ لە بەزەیی‌یەوە سەیری ئەکردو سەری بۆ من هەڵبڕی‌و لە چاویا دیاربوو پرسیار لەمن ئەکا چی‌بکەین ؟ منیش بەو هەستەی ئەوەوە دووا تەماشای ئەو بەسەزمانەم کردو بە ناچاری بەجێمان هێشت‌و بە بێستوونم‌ووت بەڵکو ئیتر پێ هەڵگرین چونکە وا شەو داهات‌و ڕێگەی دوو سەعات زیاترمان لەبەردەما ماوە •

شەو داهات ، بەڵام دنیا هەمووی سپی‌ی ئەکردەوە ، قسەو باسی ئەمە لای ڕێگاشمان زوربەی هەر باسی ئەو کوڕە بوو کە ڕەق‌بووبووەوە •• نزیك گوندەکەی ئەودیو بووینەوە سەگ‌وەڕ بەرەو پیرمان هات، خۆمان گەیاندە ناودێ‌و بانگمان لە کاکەو رەحمانی خانەخوێ‌ی هاوین‌و زستانی ئەو گوندەمان کردو ، بە ڕووخۆشی‌و قسە خۆشەکانی‌یەوە کردینی بە ژووورداو لەبەر ئەو زۆپا گەورەی دارەدا دانیشتین کە هەموو لایەکی وەك پشکۆ ئاگر سوور هەڵگەڕابوو ، دەستمان‌کرد بە خۆ گەرم‌کردنەوەو جل‌وبەرگ وشك‌کردنەوەو ئەوسا بەدەم لەیە ساوەرە بەتام‌و لەزەتەکەوە باسی ڕێگامان بۆ کاکەو رەحمان ئەکرد •• پێش ئێمە ئەو هەواڵی زەلامێکی لەو حاڵەو لەو ڕەنگەی لێ‌پرسین کە ئێمە یەکەم دوو کەس بووین بە مردوویی دیبوومان ••••

ووتی : زۆرم هەوڵ لەگەڵدا دا کە نەڕوات کەچی ئەیووت خاڵە پیاو پیاو بێت چۆن لە بەفر دەترسێ ••• کە بە کاکەورەحمانمان ووت ئەو کوڕەی تۆ ئەڵێی بەمردوویی لەودیو لووتکەی سەرەوەی ••

چیاکە دیمان •• قاقا دەستی کرد بە پێکەنین •• پێکەنینێـکی بـە کوڵو سەیر •• دیارە قسەی هاتبووە دی بەو جوانەمـەرگەی ووتبـوو ڕەق ئەبیتەوەو ناگەیتە جێو ئەو بە قسەی نەکردبوو !

منیش بە بێستوونموەوت : تۆبڵێی ئەو برادەرانەی هەوڵیان لەگەڵ ئێمەش دا کە بەم ڕۆژە ئەم ڕێگایە نەگرینە بەر با ڕەقنەبینەوە بە مردنمان قاقای وەك کاکەورەحمانیان لێبدایە ؟

# ژانو سـۆزی گەورە

بووراوی عەجنیە
وەرگێڕانی
نەژاد عزیـز سـورمێ

١ ـ تینوویەتی :

کۆرپەکە دەمی لە مەمکی دایکی کردەوەو وتی : ـ بۆچی تنۆکێ شیر نابینم ، تینوویەتیمی پێ بشکـێنم ؟ بەبێ دەنـگی سەیـری کرد ، زەردەمسکەیێکی خەماوی هاتە سەر لێوان ، دەستێکی بە قژی رەش‌وپڕی داهێناو بەسۆزێکەوە وتی : قسە مەکە بەرخم لێت دەترسم ، هێشتاکە تۆ پێت نەناوەتە ساڵی یەکەمی تەمەنت •••

ـ : بەڵام ئاخر شیر تاکە خواردنی منەو ئەوەتا نایشبینم ! ؟

ـ : قەیناکە ، نەختێ ئارامت بێ تینوویەتیت دەڕەوێتەوە !

ـ : چۆن تینووبم‌و ئارامم بێ ؟! لەوانەیە پێش گەورەبوون نەخۆش بکەوم ، دەشێ بمرم ••

ـ : نا دڵی داکێ نا ، گەورە دەبی‌و تەمەنیشت درێژ دەبێ •• بەڵام چاوەڕوان بە !

ـ : چیدیم توانای چاوەڕوانی نەماوە ••

ـ : سبەینێ لەو بیرەی نزیکمان ئاو دەهێنین •

ـــ : ئەوەی کە هی ئەو ئاغایەیە •
ـــ : بەڵام پێش ئەوەی بیدەنە ئەو هی ئێمە بوو ••
ـــ : ئەی کوا باوکم یاریدەمانبدا ، وەری بگرینەوە •
ـــ : باوکت بەسەفەر چووە کوڕم ، دەگەڕێتەوە •
ـــ : دایە تو خوا ڕاستە باوکم پیاوێکی چاکە وەکو خەڵکی گوندی باسی دەکەن •
ـــ : ڕاستە کوڕم ، بەڵام هەندێ ڕقیان لێی دەبێتەوە ••
ـــ : ئەی کەی دەگەڕێتەوە بیبینم ؟
ـــ : بەم نزیکانە کۆڕیەم لەگەڵ هاوڕێکانی ••• بیرەکەدەگەڕێتەوە •• هەمووممان لێیدەخۆینەوەو تینوویەتیمان دەشکێنین ••

## ٢ ـ سۆز :

سوێمبۆتەوە ، داخۆ کەی مانگ دەگەڕێتەوە حەوشەی ماڵمان ؟••

هەناسەبڕکێم لە نێوانی هاوسەری تەمەنو کۆڕیەی نووستوی باوەشم پێوەنووساوە کە خەون بە چەند دڵۆپە شیرێکەوە دەبینێ لێوی پێ تەڕبکاتەوە •• ئاگرم بەربۆتە هەناوان ، تۆش لە تەك خۆمدا نابینم بیکوژێنیەوە لەوەتەی تۆم لێدووری ، زارم وشكبۆتەوە ، لە کاتێکا گوڵێکی گەش بوو لە نێو پەنجەکانتا •

چاوم بەلەق ، بە دوای سیمای ئەسمەرو سنگی پانتدا وێڵن •• لە دەرو دیوارو جێو بالنگانی خاڵییەوە بەدەر هیچ نابینم ••

ئای چەندت غەریبی دەکەم ، ئەی ئەو خۆرەی کە پێش وادە هەڵاتی •• ئای چەندت لە سەگی برسیو کەڵبەی زاڵم لێدەترسم ••

بەرگەکانت بە کورسیەکەدا هەڵواسراوە ، چاوەڕێی گەڕانەوەت

دەکا •• بۆنی ئارەقەو خاكو خۆشەویستی لێ‌دێ •• لێرە پێخەف لــە فرمێسکی سوێرو خوێناویم‌دا توقم بووە ، تۆیش ئەوەتا لەسەر ئەو چیمەنتۆ ساردە ، نینۆك دەرکێشراو •• دەست‌و پێ‌سووتاو ، خوێنی پاکت لەبەر برینان دەڕوا •••

بۆت شێت بووم •• بگەڕێوە ••• ئەوە مێوەکانی حەوشە خەریکن گەڵای سەوزو گەش دەردەکەن •• ئەوەتا لێرەو لەوێش چەند خونچە گوڵێك خەریکن دەکرێنەوە ••

کەواتە بگەڕێوە •• بگەڕێوە بۆمان •• ئێمە چاوەڕێی تۆ دەکەین کە پێکەوە نۆبەرەی بەرهەم بخۆین ••

## ٣ ـ شایەدی :

من منارەیەکی سەر دەریاو کێلگەی کاکی بە کاکیم کــە شایەدی ڕۆژگاری زوڵم‌و بەرگری‌یە •• بۆنی پــێی داگــیرکــەرم بە تفنکان‌دا چووەو تامی گوڵاوی خوێــنی بەرگــری کەرانــم کــردووە •• هەوای شارستانیەتــی بەربــەرو قەرتاجینــەو تــورك‌و ڕۆم‌و عارەب‌و فەرەنگانم هەڵمشتووەو لەمێژووی بەرە لە دوای بەرە گەیشتووم •• بەڵام تێناگەم ئێستاکە چی لەم دێ‌یەدا ڕوو دەدا ••

سیمای گۆڕاوەو •• دانیشتوانی نووستوون‌و غەوارەش وەك مۆتەکە خۆ لە ژێر تاریکیــەکی چــڕ حەشــار دەدەن‌و دەڕژێنــە نــاو کوچــەو کۆڵانان ••

لکە زەیتوونە بڕاوەکان بوونە ئالیکی پێ‌چۆڵی ئێسك دەرپەڕیو•• شکارتەکان پێشی وادە دروێنەکران‌و گاڕانیش ڕەفزی دەکاتەوەو نایخوا • زەوی قەڵشتی چوارگۆشەیی وای تێ‌کــەوتووە دەڵــێی ئەشکەوتــە ،

درەخت لە تینوویەتیا سیس‌بوون ، هەموو باسی زولم‌و نەهاتی‌و بەیارو برسیەتی دەکەن •

خەڵکی گوندی لە کوێن ؟ کوان ئەوانەی تۆرە زێرینەکانیان مای‌و شادی‌و ژیانی تێدا دەدرەوشایەوە •• ئەی هاوڕێی زەوی کە چەنگی پڕدەکرد لە خۆڵی ڕەش داگەڕاوو بۆنی وەرزێکی ئایندەی پڕ لە خێرو بەرەکەتی دەکرد • کوائەو شوانەی کە دەیدی ڕان دەلەوەڕێ تێر دەبوو و جوتیار کە خاکی پڕ لەشینایی‌و منداڵی ئاو دەدا ؟؟

کوان ئەو ئافرەتە خۆشخوان‌و شادانەی ، کە لە سپێدەیێکی زوقما دەورەی ئەو دار زەیتوونانەیان دەدا کە بە هۆی چڕو پڕی بەرهەم‌دا هاتبوونەوەو ڕەش دەچوونەوە ؟ کوان ئەو منالانەی لەگەڵ باران‌و سەرماو زەیقەتیشدا شادو ڕووخۆش بەرەو قوتابخانە دەکەوتنە ڕێ • • ؟ ؟ کوان ؟ بۆ کوێ چوون ؟ !

هەموو لە پشت دەرگاوە خۆیان شاردۆتەوەو چاوەڕوانی گەڕانەوەی کوڕو مێردو براو خزمەکانیان دەکەن ••وەختی خۆی لە زستانە ڕۆژێکی تاوا ، غەریبەی تفەنگ بە دەست‌و شەبقەی شینکەڵە لەسەر بەرەو پێش خۆی‌دا بوون ، هەر یەکەو سەگێکی فەڕەنگیشی بە دەستەوە بوو بە پۆستاڵە ڕەش‌و بریقەدارەکانیان خاکی پاکیان دەشێلاو بێ موبالات تفیان تێ‌دەکرد •

**٤ ـ سۆزو هیوا :**

ئاوی چۆکانم چوو ئەوەندەی لەم زیندانە تەسک‌و وەحشەتەدا چاوەڕێ‌بم •• هاتن دوای ئەوەی زنجیری زوڵمیان بۆ کرد بە کۆت •• ( خۆر ) یان لە قوڵایی دەریادا لە قەنارەدا •

ڕووناکی گوندیان دزیو ڕێگاکانیان بە کۆمەڵێ بۆرە پیاوی ڕووپۆش لەسەر تەخت کردەوە •

ئا لێرەدا دایکتم دێتەوە بەر چاوان رۆڵەکەم ! ئەوەتا وێنەی لەبەر چاوما کێشراوە ، فرمێسکو سۆزی لێدەبارێ •• زەردەخەنەی تۆیش ڕۆڵەی خۆم ، گوڵو نوورم لە نێو باڵاندا دەڕوێنێ ••

« ئێوە بینایی دیدەمن ، ئێوە خوێنی بەدەنمن ، ئەو هەوایەن کە پێی دەژیمو هەناسەی پێدەدەم ، ئەو سپێدەیەن کە چاوەڕوانی دەکەم • • • »

بڵێی بشێ مێژوو وێنەی خەمباری خۆی دوای دە ساڵان بە ڕوومانا بداتەوە ؟ !

خاکی باو باپیرانیان لە نەوەکان سەندو هاتن دایانە دەست ئاغایەکی چەپەڵ کە بەرودەرگایان گەسکدەدا ••

هێشتا گوڵەگەنم سەریان لە زەوی دەرنەهێنابوو کە فرۆشتیانو هاتن کۆشکو باڵەخانەو ئۆتۆمبیلی دوا مۆدیلو سەگی فەرەنگیان پێ کڕی •• دەمی ڕاستگۆ و لاوانیان ئاسنبەند کرد •

کە لە ڕۆژێکی جەژنیشا وەدەرکەوتینو داوای گەڕانەوەی خاکو گوڵەگەنمو ( بیر )و مافی زەوتکراومان کرد ، گەمارۆیان داین •• لە دوکەڵی چاوسووتێنیانو وەرداینو سەگی برسیان تێبەرداینو بە گوللەی کوژەر بەرمان بوونێ •• ڕایانکێشاینو هەوومانیان لە زیندانێکی تەسك ئاخنی ، ناشیرینترین جنێویان پێداین • • جلەکانیان تیزماڵ کردین •• سەریان تاشین ، نینۆکیان دەرهێناین ، قنچکە جگەرەیان لە ( کۆممانا ) کوژاندەوەو شووشەی شکاویان تێبڕیو ئەوەندەیان بە

شوارکان لێدراین ، کرمان له جەستەی بڵندبوو • ئێمەش ( بێ دەنگ) ئازارمان چەشت ••

ڕۆژگار دەڕواو ، منیش که لەگەڵ هاورێکانما دێینە دەرەوە باسکمان باری گرانی ماندوویەتی ساڵانو ئاواتی ملیۆنەها ڕەنجدەری هەڵگرتووە •

ئەو کاتە (رق)مان له دڵا گەورە دەبێو هەمووومان له مەیدانی گوندا بە یەك دەگەینو دەبینە یەك لەش ، تا له ئاسمانا بروسكو له دەریادا شەپۆلی سەرشێتو له خاکیشا ئاگر بڕوێنین •• ئەو کاتە وڵاتەکەمان یەك پارچە دەکەین بە سروودو گۆرانی خۆشەویستیو تۆڵە •• لەو دیــو شیشەکانی زیندانیشمەوە خۆر هەڵدێ ، که لـە ئاسۆیـش دەردەکەوێ تاریکیو هەورە چڵکنەکان ڕادەماڵێ•• خەم مەخۆ بەرخی باوی ، خەم مەخۆ ، چاوەڕێی له دایكبوونی سپێدە بکە ! ئەو سات هەموو پێکەوە گۆرانی سەرکەوتنو ژیانێکی بەختیار دەڵێین •

---

★ بوراوی عەجنیە ، چیرۆك نووسێکی لاوی توونسییە ئەم چیرۆکەی لـە ژمارە (٤٤)ی ساڵـی ١٩٧٩ی گۆڤـاری ( قصص )ی توونسیدا بڵاوکردۆتەوە • بڕوانە لاپەڕە (٧٠) •

ـ وەرگێڕ ـ

# یادداشتی هونەرمەندێك

**چیرۆکی : عەزیز نەسین**
**وەرگێڕانی : محەمەد حەسەن ڕۆژبەیانی**

کاروباری جاران بەم ئاسانیەی ئێستا نەبوو ، والیو بەریوەبەری پۆلیس ، تەنانەت پۆلیسش پلەو پایەی خــۆی هــەبوەو بــە ئارەزووی خۆیان گەمەیان بەو خەڵکە دەکرد •

ئەو چیرۆکەی کــە دەمــەوێ بۆ ئێــوەی بگێڕمــەوە ، لەســەرەتای دامەزراندنی کۆماری تورکیادا بووە بەڵام تکایە ئەو ڕووداوانە لەگەڵ باری ئەمڕۆدا بەراوورد مەکەنو گیروگرفتی تازە بابەتم بۆ مەخوڵقێنن ، چونکە هەمووی حەفتەیەکە لە زیندان دەرچووم •

خوا « شادی زادەی » مەرحوم عاف بکات ، هەموو هاوینێك تیپێکی هونەری پێك دەهێناو ڕووی لە شارە ڤێنكو خۆشەکان دەکرد ، وەکــو دەڵێین بە تیرێ دوو نێچیری دەپێکا • یەکەم پارەیــەکی باشــی دەســت دەکەوت ، دووەمیش گەشتەکەی بە بەلاش دەردەچــوو لەم گەشــتانەدا خێزانەکەشی کە دایکی منداڵەکانو دوو کچو سێ کوڕ بــوون لەگــەڵ خۆیدا دەبردن ، بە شێوەیەك بەرنامەکەی دادەنا ، منداڵەکانیشی ڕۆڵی تێدا ببینن • بەمەش خەرجی تیپەکە کەمتر دەبۆوە •

« شادی زادە » پیکاپێکی هەبوو ، هەموو دیکۆرو کەرەستەکانیش هی خۆی بوون •

سێ چوار هونەرمەندی ژنو پیاوی بەکرێ دەگرتو لە پیکاپەکەی دەئاخنینو بۆی دەردەچوو •

ئەو ساڵە منیشی لەگەڵ خۆیدا برد ، جگە لەمن سێ هونەرمەندی پیاوو کیژێکی جوانو قەشەنگ ئەندامی تیپەکە بوون • کیژەکە ئەوەندە نەشمیلەو ناسك بوو ، هەر دەتووت هەڵووژەی پاك کراوە ، تەمەنی هەژدە ، نۆزدە ساڵێك دەبوو ، تا ئێستا یەك ، دوو جار چووبووە سەر شانۆ ، بەڵام هێشتا ڕووی نەکرابۆوەو شەرمی نە شکابوو •

ئەو تیپە گەڕۆکانەی ، کە بە شارو لادێکاندا دەگەڕێنو نمایشنامە پێشکەش دەکەن ، دەتوانم بڵێم باشترین تیپی هونەرین ، ئەو کیژۆڵانەش کە بۆ یەکەمین جار لەگەڵیاندا دەردەچنو ڕۆڵ دەبینن ، چاکترین هونەرمەندیان لێ دەردەچێت •

هەر لەبەر ئەمە « هۆلیا » ش لەگەڵماندا هات تا ئەو دەورەیە ببینێو شەرمی بشکێ ••• نازانم لەبەر جوانی ئەو کیژە بوو ، یا شتێکی تر بوو، کە من لەم سەفەرە دوودڵ بوومو وام هەست دەکرد شتێکمان تووش دەبێت •

هەرچۆنێك بوو بەرەو « قۆنیە » بەرێ کەوتین ، بەرنامەکەمان بەم شێوەیە دانابوو • هەر شەوەی لەیەکێ لە شارۆچکەکانی دەوروبەری « قۆنیە » نمایشنامەیەك پێشکەش بکەین شەوانی یەکەمو دووەمو سێیەم بە باشی بەسەر چوون ، سەر لەبەیانی ڕۆژی چوارەم بەرەو شارۆچکەیەکی تر ڕۆیشتین • لەڕێ پۆلیس پێشی لە پیکاپەکەمان گرت :ــ

- دابەزنە خوارەوە •
ژنەکانمان بەجێ هێشتو خۆمان هاتینە خوارەوە ••
پۆلیسەکە ووتی :ـ
- با ژنەکانیش دابەزن ••
ئەوانیش هاتنە خوارەوە •• پۆلیسەکە ماوەیەك تەماشای قەدو بالآی
کردین‌و پاشان ووتی :
- پێناسەکانتان دەربێنن •
پێناسمان پێ‌بوو ، بەلآم لەبن دیکۆرو کەرەستەکانا بوون • بـۆ
دەرهێنانیان دەبوایە هەموو سندووق‌و جانتاکان لە پیکاپەکە دابگرین،
ئەم کارەش زۆر دەخایەنێت •
« شادی زادە » ش مامۆستای ئەم کارانە بوو ، وەك دەڵێن شەیتان
لێی نەدەبردەوە • دەست لەسەر دەست نۆکەر ئاسـا لێی نزیك
بۆوە • کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێناو دایە دەست پۆلیسەکەوە :
- بفەرموو ••• تەماشاکە مەرەخەسیمان پێیە •
من لە پشت پۆلیسەکەوە ڕاوەستابووم • تەماشام کرد لیستەی ئـەو
شت‌و مەکانە بوو کە لە ئەستەمبووڵ کڕیبوومان ، مۆرو ئیمزاشـی
لەسەر لیستەکە هەبوو • پۆلیسی ئەو سەردەمەشـی خوێندەواریان
نەبوو ، هـەر کاغەزێ مۆرو ئیمزای لەسـەر بوایـە بە کاغـەزی
ڕەسمیان دەزانی‌و ڕێزیان لە هەڵگرەکەی دەنا• پۆلیسەکە لیستەکەی
وەرگرت جارێ لە ئێمەی دەنواڕی ، جارێ لە لیستەکە ، سـەرئەنجام
ووتی :ـ
- ڕیـز بن •

وا دیار بوو کەوتبووە گومانەوە ، بۆیە وا بەتوندو تیژی ڕەفتاری لەگەڵدا دەکردین •• ڕەنگە وابزانێ ئێمە قاچاغچینو بەبیانووی نمایش کردنەوە بمانەوێ تریاك لەو گوندانە بفرۆشین •

چارە نەبوو ، هەرچی بووتایە دەبوایە جێبەجێ بکرێ ، بەڵکو خوا بیکاتو لە کەڵی شەیتان بێتە خوارەوەو ڕێمان پێ بدات ••• یەك لە دوای یەك ڕیز بووین ، پۆلیسەکە لە « شادیزادە »ی پرسی :ـ

– ناوت چییە ؟ •

– شادیزادە ••• سەرۆکی تیپەکەم •

پۆلیسەکە تەماشایەکی لیستەکەی کرد ، وەك بڵێی بە دوای ناوەکەیدا دەگەڕێ ، لەبەر ئەوەی من لە نزیك پۆلیسەکەوە بووم ، هەرچی بکردایە دەمدیت ، پەنجەی بەسەر ناوی شتو مەکەکانی لیستەکەدا هێناو برد ••• وەك بڵێی ناوەکەیی دۆزیبێتەوە ، بە گورجی پەنجەی لەسەر ناوی « دوو دەست جلی ناوەوەی ژنانە » داناو ووتی :

– تۆ بڕۆ بەو لاوە ••• ناوەکەت ڕاستە •

شادیزادە لەو لاوە ڕاوەستا •• پۆلیسەکە قەڵەمێکی لە گیرفانی دەرهێناو تووکەکەیی لە زاری خۆی ئاخنیو پاشان نیشانەیەکی لە بەرانبەر ناوەکەی « شادی زادە » دانا ! ! ئینجا لە دووەم کەسی پرسی:

– ناوت چییە ؟ !

– خەیری •

– پۆلیسەکە دیسان بە لیستەکەدا چۆوەو وەك بڵێی ناوی « خەیری » بەرچاو کەوت ، قەڵەمەکەی خستە زاریەوەو نیشانەیەکی بەرانبەر بە ناوەکەی ئەویش دانا ! !

– تۆیش بڕۆ بەو لاوە •

نۆرەی من هات ، پۆلیسەکە پرسی :ـ

- ناوی تۆ چییە ؟ ! !

- حەسەن کول زادە ! ! !

نازانم چۆن ئەمەم لە دەم دەرچوو ، خۆ ئەمە ناوی سەرۆك وەزیران بوو • منداڵەکان دایانە قاقای پێکەنین ، هەر خوا رەحمی کرد پۆلیسەکە تێنەگەیشت ، بەڕاستی خۆیشم زۆر ترسام ، ئەگەر تێبگەیشتبایە خۆ بابمی لە گۆڕ دەر دەهێنا •

وەکو قوتابی خۆم بۆ تاقی کردنەوە ئامادە کردو هەرچۆنێك بوو توانیم تەوژمی پێکەنینەکەی ناخم بخنکێنمو چاوەڕوانی سەرئەنجامم کرد •

پۆلیسەکە بەدوای ناوەکەمدا دەگەڕا • لەسەر « زەنگۆلەیەك » گیرسایەوە ••• دەست بەجێ ووتم :ـ

- خۆی نییە ••• کەمێ خوارتر •

« سێ جووت پێڵاوی ژنانە » م پیشاندا ، ئیتر بە تەواوەتی دڵنیا بووم ••• ئەویش هاواری کرد :ـ

- ئەی کوێری •• نابینی منیش نیشانەم لەوێ داناوە •• ناوی کێی دەپرسی ، نیشانەیەکی بەرانبەر دادەنا •• ئەویش دەڕۆیشتو لەو لاوە رادەوەستا ••• نۆبە هاتە سەر ژنەکان •• بە دەنگێکی نەرمترو بەرێزەوە لە « هۆلیا » ی پرسی :

- باشە • جەنابتان ناوتان چییە ؟ •••

لە شادی زادە نزیك بوومەوەو ووتم :ـ

- کچەکەی لە دەست دەرکردین ....
- نا هێڵین ...

لەم چەقی ڕێگایەدا چۆن دەتوانین خۆمان لەچنگی پۆلیسی کۆماری ڕزگار بکەین ! ؟ !

- جارێ ئارام بگرە ، بابزانین چی دەبێ ...

---

« هۆلیا » بە شەرمێکەوە ووتی :

- هۆلیا .
- بەھ ... بەھ ... فەرمووت هۆلیا ؟ ناوەکەشت وەك خۆت جوان و قەشەنگە ... تۆ وەرە پشت من ڕاوەستە ، با هەتاو کارت لێ نەکات.

بەم فڕوفێڵە کچەکەی لە ئێمە جودا کردەوە.... من هەناوم پچڕا دەمزانی هەر وا بە ئاسانی ڕازی نابێت ، بەڵام نەمدەزانی نیازی « شادی زادە » چیە ، وا زەردەخەندە دەمو لێوی بەر نادات ...

پاش ئەوەی هەموو ناوەکانی لەگەڵ لیستەکەدا بەراوورد کردو نیشانەی بەرانبەر هەریەکەیان دانا ، هێشتا شەش شتی تر مابۆوە ... لە شادی زادەی پرسی :-

- ئەی ئەوانی تر لە کوێن ؟ .

( شادی زادە ) بێ ئەوەی خۆی بپەشۆکێنێ ووتی :

- لە « قۆنیە » بەجێ مان .
- ئیجازەی کارکردنتان هەیە ... ؟ ! ! .

« شادی زادە » دەست بەجێ کاغەزێکی پڕ لە مۆرو ئیمزای تری دەرهێناو ووتی :-

- بەڵێ قوربان ••• فەرموو ••

پۆلیسەکە کاغەزەکەی وەرگرت و هەندێ تێی راما ، پاشان ووتی :

- باشە ••• ئەی گەواهی‌نامەی بەند نەکردنتان « عدم المحكومية » هەیە ؟

- بەڵێ ••• ئەمیش ئەو گەواهی نامەیەیە •• ئا ئەمەش گەواهی نامەی تەندروستی‌یە ••• ئەمیشیان •••

پۆلیسەکە داوای چی دەکرد ، شادی زادە دەست و برد کاغەزێکی چاپ کراو ، یاخود لیستەی حیساب و ئەم جۆرە شتانەی بەدەستیەوە دەدا ••• ئەویش هەندێ تەماشای دەکردن ، ئیتر هیچ بیانوویەکی بۆ راگرتنمان نەدۆزیەوە ••• کۆکەیەکی بۆ کرد و ووتی :

- لەبەر ئەوەی دزو رێگر لەم ناوە زۆرە داوای لێبووردنتان لێ دەکەم ••• ئیتر وەزیفەیە •

شادی زادە پێکەنی و ووتی :

- بەڵێ •• فەرمانەکەتان وا پێویست دەکات کەمێ توندو تیژ رەفتار بکەن •••

- باشە •• سواربن •• خوا حافیزتان بێت •• پیاوەکان سەرکەوتن تا دەستی ژنەکان ڕابکێشن و سواری پیکاپەکەیان بکەن •• چاوی بە دەهۆڵ و زوڕناکە کەوت و دایە قاقای پێکەنین :-

- بەلای کەمەوە ئەوانە داگرن و هەندێ شایی و سەما بکەن •••

- شادی زادە دەستەکانی بەیەکدا دا : -

- بە خوا ئیشمان هەیە و درەنگمان پێ دەچێت ••

پۆلیسەکە قۆناغە تفەنگێکی بە پشت «شـادی زادە » دا کێشـا و ووتی !

— لەوە زیاتر قسە مەکە ••

شادی زادە دیسان ووتی :

— بەخوا پەلەمانە ••

— باشە مادام پەلەتانە فەرموو بڕۆن •• بەس ئـەم خانمـە بـا لێرە بمێنێتەوە ! !

— چۆن ؟ ! !

— یەکەم ناوی لە لیستەکەدا نی‌یە •

— چۆن نی‌یە ••• تەماشاکە •••

شادی زادە لە لیستەکەدا « کراسێکی ژنانە »ی پیشان دا :ـ

— کاکە لەخوا بەزیاد بێ خۆ جەنابتان خوێندەواریتان هەیە •••

ئەمە تا ••• بیخوێنەوە •• پۆلیسەکە پاڵێکی بە شادی زادەوە نـاو دووری خستەوە :ـ

— من سەرم لەمانە دەرناچێت ••• با ناوی ئەویش بێت •••

پیاو یەك قسە دەکات ! پێویستە ئەم خانمە تا سبەی بەیانی لێرە بمێنێتەوە ! ! •

شادی زادە تەماشای کرد کار بەرەو خراپـە دەڕوات • ووتـی :

— کەوای لێهات دەهۆڵو زوڕناکە داگرنە خوارەوەو زنەکان هەندێ سەمـا بـکەن • •

پۆلیسەکە ئەمەی پێ خۆش بوو •••

پیاوەکان بۆ داگرتنی دەهۆڵو زوڕناکە سەرکەوتن ، بەڵام گرێی گوریسەکان بەئاسانی نەدەکرانەوە •

پۆلیسەکەش لە خوارەوە هەر فەرمانی دەداو هەموو بیرو هۆشی لای دەهۆڵو زوڕناکە بوو •

( شادی زادە ) ژنو منداڵەکانی لە پێشـەوەی پیکابەکە دانا تەنهـا « هۆلیا » مابۆوە ••• پاشان بە پۆلسەکەی ووت :

— کاکە •• هەی بە قوربانی ئـەو هـێزو بـازووەت بـم ••• خۆت سەرکەوەو بیان کەرەوە ••• ئەمانە پیاو نین ••• هەر دەڵێی نان ناخۆن ••• پۆلیسەکە ئەم پیاهەڵدانە فشی کردەوە •• دەسـتێکی بە سمێڵەکەیدا هێناو تفەنگەکەی لە بن دارێك داناو وەك مەیموون بە یەك قەڵەمباز سەرکەوتو هاواری کرد :

— ڕێ بەردەن ••• با من بیان کەمەوە ••

« شادی زادە »ش دەست بەجێ هۆلیای سوار کردو لە چـاو نووقانێکدا دەریەڕی • • •

پیکاپەکە تا دوێنێ بە پاڵ دەڕۆیشت ، کەچی ئێستا وەك فڕۆکـە بۆی دەرچوو ••• ئێمـەش وەك گەڵای پـایزان بەسەر یەکـدا کەوتین • •

پۆلیسەکە دەستی کردە جنێو دان ••

— سەگبابینە ڕای گرن •• تەعەدا لە پۆلیسی دەوڵەت دەکەن • ژنی •• هەموو • • • تان • • • دە • • • • • بایەکەی ئەوەند بـە هێز بـوو ، پۆلیسـەکـە جنێوێـکی دەداو دەکـەوت ، دیسـان هەڵدەستایەوەو لەلایەکی تر ڕادەوەستا ••

— هەی دایك •••• بێ شەرەفینە ڕای گرن ، ناکەس بەچە ، هەقم بەسەر کچەکەوە نی‌یە ••• ڕایگرە با بەدوای کاری خۆمدا بڕۆم ••• بەردەوام دادو بێدادی بوو و جنێوی دەدا ، کەس خۆی تێنەگەیاند ، ئەویش هەر ئەم بەرو ئەو بەری دەکردو جنێوی دەدا ••• سەر ئەنجام کەوتە پاڕانەوەوە :ـ

— برایان بۆ خاتری خوا ••

شادی زادە ووتی :

خۆت ماندوو مەکە ، دەچینە شارو لە بەردەم بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس دات دەگرین •

پۆلیسەکە پڕ قورگی بوو لە گریان‌و خۆی بەسەر دەست‌و پێماندا دا :ـ

— کاکە گیان ، بەخوا گاڵتەم کرد بۆچ ئێوەحەز بەگاڵتە ناکەن • • بۆ خاتری خوا ، ئەگەر جەنابی معاون بەم شێوەیە بم‌بینێ لەت لەتم دەکات •• تفەنگەکەم لەوێ بە جێماوە • تفەنگیش ئابرووی سەربازە •• لێم گەڕێن با ملم بشکێنم ••• گووم خوارد ••• بەرەڵلام کەن ••

( شادی زادە ) سەری لە جامی ئۆتۆمبیلەکەوە دەرهێناو ووتی :ـ

— خۆ کەس تۆی نەگرتووە •• دەخۆت فڕێ بدە خوارەوەو بڕۆ •

— من بە حاڵ خۆم بە پێوە ڕاگیرکردووە ••• چۆن دەتوانم خۆم فڕێ بدەمە خوارەوە •

سەرئەنجام گەیشتینە ناو شار •• شادی زادە راست بەرەو

پۆلیسخانەیێی پێوە نا ••• وای دەزانی کارێکی باش دەکا و ئەو پۆلیسەی کە ئیش‌و کاری خۆی نازانێ‌و تەماح مە ناموسی خەڵکی دەکات ، دەیداتە دەست سەرۆکەکەیەوەو •••• خۆزگە هەر لەو رێگایــە پۆلیسەکەمان دادەگــرت‌و خۆمــان تووشی ئــەم دەردی سەری‌یە نەدەکرد ••• شادی زادە لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزی‌و چووە لای بەرێوەبەری پۆلیس‌و هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە •••

جەنابی بەڕێوەبەریش ئێمەو پۆلیسەکەی بانگ کرد • هــەر چیمان بینیبوو بێ زیادو کەم گێڕامانەوە •• بەرێوەبەر ئەوەندەی لە پۆلیسەکە هەڵدا ، هــاوارو ناڵــەی گەیشتە ئاسمان ، پاشانیش بڕیاری دا بۆ ماوەی یەك حەفتە بەند بکرێت ••

شادی زادە بە ئەسپایی‌یەوە پێی ووتم :ــ

ــــ کچەکەمان لە چنگ پۆلیسەکە رزگار کرد ، بەڵام بەخوا لە دەست بەڕێوەبەر رزگاری نابێت ••

سەرەتا باوەڕم نەکرد ، بەڵام پاشان قسەکەی شادی زادە هاتــە دی •• جەنابی بەرێوەبەر ئێمەی بەرەڵلا کرد و کچەکەی گــل دایەوەو ووتی : سێ رۆژ دەمێنێتەوە •• بە شادی زادەم ووت :ــ

ــــ با بڕۆین لای یەکێکی لەم گەورەتر شکات بــکەین •• خۆ ئــێرە چۆڵەوانی نی‌یە • پارێزگار هەیە •• دادگا هەیە • هەر یەکێك دێت بەدەنگمانەوە •• شادی زادە ڕازی نەبوو :

ــــ نە کاکە گیان •• باش نی‌یە •• پۆلیسەکە بە شەوێك ڕازی بوو •• جەنابی بەڕێوەبەر بە سێ رۆژ •• تا بەرز تــر بــڕۆین زۆر تــر دەکات‌و دەگاتە حەفتەیەك‌و مانگێك‌و شەش مانگ • هەر چۆتێك

بێت دەستو پێوەندەکان باشترن • سێ ڕۆژ لەو شارە ماینەوە ، دەمەو ئێوارەی ڕۆژی سێیەم کچەکەیان بەردا ، بەلاّم لەگەڵ سێ ڕۆژی لەمەوبەردا جیاوازیەکی زۆری هەبوو • لەماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا ئەوەندە پێشکەوتبوو ، هونەرمەندێکی ڕەسەنی لێدەرچوو بوو و ڕۆڵی خۆی بەجوانی دەبینی •

ئەو سێ ڕۆژە ئێمەش پارەیەکی زۆرمان خەرج کردو گەلێ هەلی باشمان بۆ هەڵکەوتو لەکیس چوون •••

قانزاج هەر ئەوە بوو ، کچەکە شەرمو شکۆی شکابوو و بە بێ ترسو لەرز دەچووە سەر شانۆ •••

لەو شەوە بەدواوە دوو قاتی وەردەگرت •••

شادی زادەی خوا لێخۆش بووش بە بۆنەی ئەم سەرکەوتنو پێشکەوتنانەوە بێ سێو دوو ڕەزامەندی لەسەر هەموو شتێک پیشان دەدا •

# بەڵگەیەکی تری دیداری چیرۆکی کوردی
# لە سەری ڕەش (١)

## ٢٥ ـ ٢٧ ـ ئابی ١٩٧٩

**مستەفا ساڵح کەریم**

بەڕێز جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاپەڕاندن
میوانـە بەڕێزەکان
ئەندامە دڵسۆزەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد

بەناوی دەستەی بەریوەبەری لقی یەکێتی نوسەرانی کورد لـە سلێمانی کە دڵسۆزانە بۆ دیداری چیرۆکی کـوردی هەوڵو تەقـەلای مەردانەیدا ، پڕبەدڵ بەخێر هاتنتان دەکەمو لەناخەوە سوپاسی لیژنەی ئامادەییو ئەندامەکانی لقمان پێشکەش بـەو روناکبیرانـە دەکەم کـە بەدەنگمانەوە هاتنو دڵسۆزانە یاریدەیاندایین بۆ سازکردنی ئەم دیدارە نۆبەرەیەی کە یەکەمین میهرەجانـە بـۆ چیرۆکـی کـوردی تەرخان دەکرێ •

---

(١) ئەم وتارەی مستەفا ساڵـح کەریم کـە لـەو دیـدارەدا خوێندیەوە وابڕیاربو بە ناوی لیژنەی ئامادەییەوە بێ ، بەڵام لەبـەر هەنـدێ هـۆی تایبەتـی لەوساتەدا بڕیـاردرا بـە ناوی لقـی سلیمانیەوە بیخوێنێتەوە •

بەڕێزان : پرسیارێك زۆر جار دێتە ئاراوە ، ئاخۆ کێ بن ئەوانەی بەر لە کەسانی دی ، بەرپرسیارن ؟ بەرامبەر هەمو ناتەواوی و ناڵەباری یەکی ناو کۆمەڵگا لە جەنگان ، کێن ئەوانەی ئاسۆیەکی فراوانی پێشکەوتن بۆ جەماوەری زەحمەتکێش دەنەخشێنن ؟ کێن ئەوانەی بەدوی ئەوەدا دەگەڕێن ، ژیانی تەڵەکەبازی بگۆڕن بە ژیانێکی خاوێن و بێگەردو پڕخۆشەویستی ؟

بێگومان وەڵامی راستەقینەی ئەم پرسیارانە ئەو نووسەرانەیە نرخی وشەی پیرۆز دەزانن و قەڵەمەکانیان بۆ ئازارو ئاواتی نەتەوەکەیان تەرخان دەکەن •

بۆبەدی هێنانی ئەم ئامانج و ئاواتە ، نووسەرانی کورد لەمێژە ، بەهیوا بوون گردبونەوەیەکی رێك و پێکیان ببێ و لەنزیکەوە یەکدی بناسن و شارەزای تاقی کردنەوەی یەکتر ببن •

لەو رێبازەدا هەبو بێ دەنگ و خۆکەنارگر ، هەش بو ، وەك پەروانە بۆ ئەو مەسەلە پیرۆزەی بڕوای پێ بو دەسوتا ، بەڵام بەشی هەرەزۆریان لەسەر ئەوە پێك هاتبون کە تەقەڵلای دڵسۆزانەیان یەك خەن بۆئەوەی روبارەکان وشك نەبن ، گوڵاڵە سوورەی هەردەکان نەخرێنە ژێر پێوە ، بەری درەختەکان هەڵنەوەرێن ، بەپەرۆش بون بۆ رەهێڵەی بارانێکی بەتاو ، تا زەوی یە تینوەکان پاراو بکات •

بەڕێزان : لە ١٠-٢-١٩٧٠دا ئاواتی دێرینی نوسەری کورد هاتەدی و یەکێتی نوسەرانی کورد وەك رێکخراوێکی ئەدەبی دیموکراسی و پێشکەوتنخوازی دژ بە ئیمپریالیزم و زایونیزم و چەوسێنەرو کۆنە پەرستی ، لەدایك بو ، لە یەکەم شەوی ئاهەنگی لەدایك بونیەوە بەشێوەی عاشقێك

که چاوەڕوانی دڵدارەکەی دەکات وەك کەس‌وکاری ئاوارەیەك که لە ئێزگەیەکدا چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکەن ، وەك وێڵێکی تینوو که تووشی کارێزێك دەبێ ، ئاوا نووسەرانی کورد لە دەوری ئەستێرەکەیان کۆبونەوەو قۆڵی مەردانەیان لێ هەڵکرد بۆ ئەوەی ئەستێرەکە هەر گەش بێ‌و هەمیشە بدرەوشێتەوە ••• ڕێپیشاندەری ئەو کاروانە بێ چاویان تێ‌بڕیوەو لەبەر ڕۆشنایيەکەیدا دڕ بە تاریکەشەو دەدەن •

یەکەم هەنگاو کۆنگرە مێژووییەکەی حوزەیران •

دوەم هەنگاو گۆڤاری نوسەری کورد •

ساڵ بەدوای ساڵدا یەکێتی بو بەرێکخراوێکی پرشنگدار ، هەمو قەڵەمە خاوێنەکانی گرتە خۆی ، باوەشی بۆ لاوان کردەوەو دەستی دایە باڵیان •

سێیەم هەنگاو ڕاهێنانی جەماوەر لەسەر کۆڕە ئەدەبیەکان کە بو بەپەیڕەوێك تائێستا بەردەوامەو ڕێگای دوور لە بەردەم خوێنەرو روناکبیری کوردا نزیك‌دەکاتەوە •

بەرێزان : ئەستێرە گەشە کز بو ، بەڵام ئاوانەبو ، ساڵێك لەمەوبەر لەکۆنگرەی پێنجەمدا بە خوێنێکی نوێ شادەمارەکانی پاراو بوو ، بە هیمەتی مەردانەو گیانی لەخۆبوردن ئەندامان‌و یاریدەی روناکبیران یەکێتی بەخۆی‌و سێ لقیەوە هاتەوە مەیانی چالاکی ئەدەبی‌و روناکبیری، وە بەپێی ئەو بڕیارانەی لەو کۆنگرەیەدا درا دەبو لەم‌ساڵەدامیهرەجانێ بۆ شیعرو دیدارێك بۆ چیرۆك ساز بکرێ هەموان دەزانن کە لە ٢٩ و ٣٠ی مارتا لە شاری سلێمانی میهرەجانی دوەمی شیعری کوردی بەوپەڕی

سەرکەوتویی‌و قەشەنگ‌ترین وێنە سازکرا ، کە تائێستاش شیعرەکانی میهرەجان لەگوێی جەماوەری کوردا دەزرنگێتەوە •

بۆ بڕیاری دوەمیش هەر لە سەرەتاوە هەوڵی بۆ درا ، بەڵام هەندێ کۆسپی نالەباری وا خرایە بەردەمی کە زۆرجار دەگەیشتە رادەیەك لەو هەوڵ تەقەللایە سارد ببینەوە ، بەڵام لە مانگی ئابدا جارێکی‌تر کەوتینەوە خۆمان‌و پەیوەندیمان بە کاربەدەستانەوە کردو گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە دەبێ هەواری چیرۆکی کوردیش سازبکرێ ، بەم شێوەیە چیرۆك ـ نوسەکان‌و رەخنەگرەکان لە هەموو شارەکانی کوردستانەوە ، لە بەغداو لە شارانی‌ترەوە رویان‌کردە هاوینە هەواری «صلاح‌الدین» بۆ بەشداربون لەم فیستڤاڵەدا کە بێگومان ئاسۆیەکی نوێ لە بەردەم چیرۆك‌نوسەکانا بەدیاردەخاو دەبێتە باشترین‌و بەپیت ترین دیدار بۆ گفتوگۆو لێدوان دەربارەی رێبازی نوێی چیرۆکی کوردی هەرچەندە لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم : کە ئەم دیدارە خنجیلانەیە بریتی نیە لەو هیواو ئاواتەی ئێمە دەمان‌ویست بێتەدی ، لە لایەك کەمی رۆژانی دیدارەکەو تێك‌خزاندنی باسەکان لە لایەکی‌تریشەوە کەمتەرخەمی هەندێ لەو برادەرانەی روویان لێ‌نرابو ، بۆ نوسینی باس‌و لێکۆلینەوەو بە دەنگمانەوە نەهاتن یان بەڵێنیان‌داو لەدوایيدا لێی پاشگەز بونەوە ، یان باسەکانیان بە باسی‌تر گۆڕی •

وە یەکێ لەوانەش کە جێی دڵگیریمانە ئەوەیە کە نەتوانرا باسەکان بگۆڕێتە سەر زمانی عەرەبی‌تا بتوانین دەستەیە لە چیرۆك‌نووس‌و رەخنەگ ناسراوەکان لە برا عەرەبەکان بانگ‌بکەین‌و بەشداریمان لە گفتوگۆو لێکۆڵینەوەکانا بکەن •

بەڕێزان : کاتێك چاو بە هۆڵەکەدا دەگێڕم‌و ئەم چەپکە گوڵە ڕازاوەیە لە چیرۆکنوس‌و ڕەخنەگر دەبینم پێی دەگەشێمەوە ، لە هەمان کاتیشدا تەزویەکی سارد بەلەشما دێ کە لە ریزی پێشەوەی دانیشتوانا دەستەیەك لە شۆڕەسوارانی مەیدانی چیرۆکی کوردی وەك شێخ مارفی بەرزنجەیی‌و مەحمود ئەحمەدو لەتیف حامد بەدی‌ناکەم کە سێ گوڵی هەڵوەریوی ئەدەبی کوردین‌و چیرۆکنوسی کورد قەرزاری هەوڵ‌و تەقەللاو ڕێچکە شکاندنیانە •

خوشك‌و برایان :

جێی خۆیەتی ئەگەر بڵێین دەبێ ئەم دیدارە سەرەتایەکی نوێ بێ بۆ ڕەخنەگرەکانمان پێش چیرۆکنوسەکان ، با ڕەخنەی ئەدەبی لە خزمەتی ئیبداعی ئەدەبیدا بێ ، دوور بێ لە تیرەگەری‌و دەستیاو ، لە شەڕە گەڕەك‌و قسەو ناتۆرەی سووك ،

با ڕەخنەی ئەدەبی ڕێپیشاندەرو ڕابەر بێ •

خوشك‌و برایان :

ئەم دیدارە نازدارەمان دەبێ قوتابخانەیەکی نوێ بێ شتی تازەی لێوە فێرببین ، دەبێ ئاوڕدانەوەیەکی زیرەکانە بێ بۆ ئەو نوسەرانەی بەردی بناغەی ئەم هونەرەیان داناو بەرێزەوە سەیری هەوڵ‌و تەقەللاو بەرهەمیان بکرێ •

دەسا ئەی سوارچاکانی مەیانی چیرۆکی کوردی ئەسپی خۆتان تاودەن ، لە شایی‌و زەماوەندی دیداری چیرۆکی کوردیدا گۆرانی بۆ

مرۆڤو مرۆڤایەتی بلێین ، بۆ ژیانێکی بەختیارانەو دوارۆژێکی باشتر بۆ میلەتەکەمان بچریکێنن ••

با چیرۆکەکانمان مۆرکی خۆماڵیی پێوەبێ ، با بۆنو بەرامەی دەشتو هەردو چیاو لالەزارو بەفرو کانیاوی کوردستانی لێ بێ •

با چیرۆکی کوردی بنوسین کە پێناسی تایبەتی خۆی هەبێ •

ئاواتەخوازم سەرکەوتوو بن •

سەربەرزی بۆ وشەی ڕەسەنی کوردی

**سوپاس •**

# ئاگاداری

تکایە لە دێڕی (١٩) ی لاپەڕە (٣٤)ەوە تادوایی لاپەڕەکە بەمجۆرە بخوێننەوە :

ئەم دوو دەنگە جیاوازە لە هەمان بیئەدا دەرکەوێو دوو مانای جیاواز ببەخشێ • واتا هیچ ووشەیێك لە زمانی عەرەبیدا نییە تیایا بە ئاڵوگۆڕ کردنی ئەم دوو دەنگە مانا بگۆڕێ • واتا فۆنیم شتێکی (مجرد) ە تەمیسلی چەن دەنگێکی جیاواز ئەکا لە زمانێکی تایبەتیدا •

لە دێڕی (٢) ی لاپەڕە (٣٥) یشدا لەپاش وشەی « وەك » نیشانەی // دابنێ •

## مەڵێ پاپیر

**عبد الرزاق بیمار**

کەوا ئەمڕۆ بەزم بەزمی ئازیزی‌یە
باخی عومرم پاییزی‌یە !
دە لێی گەڕێ ، باخی پاییز
هاوینە گچکەلەی ساڵی بوو بە میوان :
کە شازادەی هیواو فەڕو بەرچاوتێرە ،
بۆ کاروانی خەمداگرتووی دڵی مەستان
هیوایەکەو
هەر جار دەبێتە ئەستێرە •
دەی با گوڕی هاوین دیسان وەك شەماڵێ
بۆنی گوڵان ،
جوانیی پەپوولەی سەر چڵان ،
خوێنی دڵان بەجۆش بێنێ •
دەی با لاوی لە تەمەنێکی پتەودا
خۆی بنوێنێ ،
هەرچی خۆشەویستی بیڵێ
کەس هیچ ناڵێ !

× × ×

گوڵەکەی من ! مەڵێ پاییز
دە توخوا ناوی مەهێنە
بڵێ : هاوین ، بڵێ : بەهار
دڵی یادگار مەشکێنە

یادگاری رۆژێك لە باغچەی بەهارا
خۆمو کەمانچەی بێفیزم
گۆرانیی ( بەرەو پاییز ) م
لەبەردەم شۆخی نازدارا
دەگوت ، دەمویست بە گەرمایی
بەهارانەی بەستەکانم
بەفری دڵی خەمی پاییزان لێنیشتوو
بتوێنمەوە ..
ووزەی ژینی هەمیشەسەوز بژێنمەوە
دە تۆش .. با گۆرانی بڵێین
گۆرانیی بەهاری بە خوڕ
گۆرانیی هاوینی بەگوڕ .
مەڵێ پاییز
گوڵە ! خۆ بەهارم نەدی
تێر لە کانیی چاوەکانما
خۆیان بسمیل نەکرد گوڵی
سوورو سپی ،
لە بەهارا بەرۆژوو بووم
هەر برسی بووم
چیبوو مەلا بانگی نەدا ،
روومەتی مانگی شەوڕۆییم
تامی نانو ئاوانی بەربانگی نەدا ؛
کچی ئاواتم عەورەتی
خەمباری با دایدەپۆشی

دەسماڵێکی جانگی نەدا ! ؟

× × ×

**تۆم بەهاری**

هەر تۆم یاری !
کە دوو بە دووین ، تۆ مۆمێکی دایساوی
نە دەتوانم بەسەر خەرمانەی گڕەوە
لەنگەر بگرم
نە دەتوانم ئارام بگرم .
کە دوو بە دووین
وا مەزانە من هەر مەستی بەژنو باڵام
پەنجە تامەزرۆی ووشینی قژی خاوم
مەلەوانی گۆمی جادووڕێژی چاوم !
ئەوا ژیان دڵی مەلێکی گیراوە
بەکوڵ ، بەتاو بەسەر سنگمەوە لێدەدا
ترپەی گەرمی تێکەڵ ترپەی دڵم دەکا ...
من ژیانم بە دۆڵو لوتکەی شاخەوە
بە دڕکو گوڵی باخەوە
بە رووی زبرو پەرداخەوە
لە باوەشی گەرم ناوە .

× × ×

من سەرمەستی خۆشەویستیی ئەم جارەم
من هەمیشە دڵبزێوی بەجۆشی ئەو بەهارەم
تیشکی چاوی پەریزادەی بەیاییت
دەموچاوی خواناسی کڵیساییت ،

ووشه‌كانت ،
خه‌یاڵه به ووشه‌كانت
بانگم ده‌كه‌ن له ناخی
لاویمه‌وه بۆ سه‌رچاوه بڕوانم

× × ×

ئێمه له تارمایی پاییز یاخی یاخی
وه‌ره بچینه‌وه شاخی هه‌میشه لاو ..
به‌ناو دۆڵو دارو ده‌وه‌ن‌و به‌نده‌نا
به ئاوه‌ڕۆی وشكه رووباری وه‌ته‌نا
هه‌وراز ده‌چین .
چه‌پكی هه‌تاو
تافگه‌ی شه‌رمنی قژی خاو
ده‌نه‌خشێنێ ،
پشكۆی كوڵمه‌ی سوور هه‌ڵگه‌ڕاو
نم نم عاره‌ق هه‌ڵه‌قوڵێنێ ،
پێ‌وپانی له زیخ‌و چه‌وی ده‌راوانا
به‌رۆك به گوڵی كێویله‌و
ناوچه‌وان به بای كاوانا
دڵ‌و ده‌روون له دولبه‌ریی كوردستانا
پاراو ده‌كه‌ین ،
بۆ ته‌مه‌نێك هه‌ڵمه‌ت ده‌به‌ین
به‌هارێكه وه‌كو تۆ جوان ،
دڵسۆز ، بده ، نه‌رمونیان‌و خان‌ومان .

# زینـدەخـەو

جمال محمد اسماعیل

شنەی شەماڵێکی تینوی ••• ،
تاڤگەو هەڵدێرو چیام من ••
ئۆخژنی رازی کچێکی •• ،
زیندوی بە بیرو بروام من ! !
تابلۆی ئاونگی ژێر چەنەی ••،
بوکی گەراوەی سەر زینم •• ! !
خەمی گەرمی ناو پریاسکەی •• ،
وێرانە دێی « خاتوزینم » ••!!
دەمی لەگۆکەوتوی ساتی •• ،
یەکەم جێژوانی •• یارێکم •• ،
هەنگاوی بەسامەی کاتی
لاوی بەرەو سەرداریکم ! !

× × ×

شۆێن پێ هەڵگری روداوی
ناو ئەفسانەی لاوکی خۆمم •• ،

ماچی ئامەزرۆی شوانکارەی ‥ ،
لێرەوارو کەژو چۆمم !!
خەونێکم لەناو پێخەفی ‥ ،
ئازادیدا خۆم نەدیوە ‥
ناوێکم چ نوسینگایەك ‥ ،
منی لای خۆی نەنووسیوە ۰ !!

× × ×

ئاواتی خواستی باڵگرتوی ‥ ،
تیژرەوی کاروانی دوورم
هەنیسکی پرقینی دایکی ‥ ،
چارشێو لە خوێناوا سوورم !!
لەناو دەواری شەوگاردا ‥ ،
چاوشارکێی ئەستێرەم دەوێ !!
لەگەڵ شریخەی قامچی‌و دار ‥ ،
دەنگی ئەو بلوێرەم دەوێ !!
نە ماچی تەوێڵی خوابیم ‥ ،
تا لە میحراب هەڵمواسن ! !
نە « منی ڕاستی » « هەلاجم »
چی داربەدەستە بمناسن !!

× × ×

کەچە شمشاڵێکی چیام ‥ ،
بۆ کۆرپەی بێ‌لانە دەگریم !!

کوره کوردێکم تا ژیام ..
بۆ مێرگی وێرانه دەگریم !!
سرتەی خەیاڵی ئەو دایکەم .. ،
خەو ناچێتە چاوی شەوێ !!
وەنەوزی گلێنەی ئەو باوکەم .. ،
لە سۆزی جەرگی ناسرەوێ . !!
شانۆی ژیانی کۆرپەکەی .. ،
دێتەوە یاد لە زیندانا .. !!
لەگەڵ هەر خەونێ خورپەیەك
بابە ... ؟ ! گیانە ..
من قەتاری ئەو قۆشەنەم .. ،
تۆفو زریان ڕای نەماڵی .. ،
من چرنوکی ئەو بەندەنەم .. ،
رۆژگار پێی نەشکابێ باڵی . !!
لەسەر بەردەبێری ئەشقی .. ،
ئەو خاکەدا « سێرە » دەگرم
یا نێچیری خۆم دەپێکم .. ،
یا بەو ئاواتەوە دەمرم . !!

× × ×

# عەودالّی چیت ؟ !

شیعری : عبدالله عباس

- ١ -

عەودالّی چیت ؟
« بالاّ ئەندام ، بەبێ دەنگی دام ئەپۆشی ...
لەنێوان نمەی شەونمو مەرگێکی کوتو پرا ..
یادگاری‌من جێ دێڵی .. ! »
عەودالّی چیت ؟
تۆ ، عاشقی خۆری دووری .. خۆرێکی دوور ..
لەدەنگ دانەوەی هاتنی خۆری عەشقا ..
ئەبیت بە شەپۆل ...
پەرۆشی یەکەم هەنگاوی ...
ئارام بەکۆتایی ناگریت ..
عەودالّی چیت ؟

- ٢ -

« پەنجەرەکان ئەکەیتەوە ..
یادگاری گشت عاشقێك بەبا ئەدەی
هەموو شتێك هەر ، کۆچ ئەکا ...
سێبەرەکەم ، بە شەپۆل دێتە ژوورەوە »
تۆ ئەبینم ...
لە کۆتایی بێزاریتو ..
پەرۆشی یەکەم هەنگاوی ..

حەزو عەشقت لەبەر ئەکەم
هەموو ڕۆژەکانیتر بەجیٚدیٚلم ••

× × ×

بەر لە تۆ ، میژوو نەنووسراوە
لە دوای تۆش دوا دیٚری ئەبڕیٚتەوە

- ٣ -

حەز ئەکەم ، هەموو رۆژیٚ
بە گوڵە گەنمی تۆو •• برینی خۆما رابوورم
حەزناکەم گویٚم لە گریانی چنار بیٚ ••
کە لەسەر برینی خۆمو لەسایەی گوڵە گەنمی
تۆدا ڕائەوەستم ••
تیشکی مەسافەی مانەوەی تۆو ••
هەنگاوی من دروست ئەبیٚ ••
چنار ئەگری ، تیشك ئاوا ئەبیٚ
لە نیٚوان خۆمو
ناوی خۆمو
شیعرەکانما •••
تۆ ناوت نیشتمانە
ئەمە عەشقەو لەم عەشقە پیرۆزتر نی‌یە

- ٤ -

ئەی ئەو کەسەی خورپەی دڵم بە دواتا ویٚڵە
سنووری عەشقم شارەزای ؟

# « تەماشاکەر لە شانۆی کوردیدا »

**یاسین قادر بەرزنجی**

خوێنەری بەڕێز : بەر لە دوو ساڵ لە ( پاشکۆ ) مانگانـەکەی (العراق)دا شتێکمان لەسەر تەماشاکەر ووتو بەگوێرەی بۆ چوونی خۆمان قۆناغەکانی کۆکردنەوەی تەماشاکـەرانی شانـۆی کوردمان کردە سێ بەشەوە (١) ••• هەر لەبەر گرنگیی ئەم باسەو ناو نەبردنی لەلایەن نووسەرو هونەرمەندانەوە ، بەش بەحاڵی خۆمان چەند شـتێکی نوێمان خستە سەر ئـەو قۆناغانـەو لـە کۆڕێـکی هونـەریدا لـە سلێمانـی پێش کەش کرا (٢) ••• وا لێرەدا شتە نوێیەکانی ئەو نووسینە دەخەینە بەر چاو بەو هیوایەی توانیبێتمان خزمەتێکی بچووکی هونەرو ڕۆشنبیریی گەلەکەمان پێ کردبێ •

**سەرەتاو بەسەرکردنەوەیەکی قۆناغەکان :**

لە عێراقدا ، کۆنترین شانۆگەریو یەکەمین بەرهەم لە سالـی ١٨٨٠دایەو لە شاری ( مووسڵ ) پێش کەش کراوە ، کە شانۆگەری (الشماس)ی (حنا حبش)ە (٣) •

شانۆگەریی کوردیش ، وەك سەرەتاو یەکەم بەرهەمی تەمسـیلی لەناو دوو مێژووی دیاریکراودا گیری خواردووەو تا ئێستا لەنێـوان

دوو بۆچووندا ماوەتەوە ، یەکەمیان ، لەو ڕایەوەیە کە سەرەتاکە دەبانەوە بۆ سەیرانەکانی سەرچناری ساڵی ١٩١٢ ، کە لە شێوەی تەمسیلێکدا جۆرە حوکمڕانییەکیان خوڵقاندووەو فەرمانڕەوا سزای گوناهبارانیانی داوەو بڕیاری خستنە ناو بەحرەکەی سەرچناریانی دەرکردووە (٤) •

دووەمیان ، ساڵانی ١٩٢٥ ـ ١٩٢٦ دەکەنە گەرادانانی شانۆی کوردەواری‌و شانۆگەریی ( عیلم‌و جەهل ) کە لە ( لولا المحامی )یەوە ئامادەکراوە و لە ژێر سەرپەرشتیی هونەرمەندی پێشڕەو ( فوئاد ڕەشید بەکر )دا پێش‌کەش کراوە ، ئەو دەمە دەکەنە سەرەتاو یەکەم شانۆگەریی کوردی‌و مەڵبەندی سەرهەڵدانەکەش شاری سلێمانی‌یە ••• لێرەدا ، ئێمە پشتگیری ڕاوبۆچوونی یەکەمیان دەکەین ، چونکە سەرەتاو لە دایك بوونی‌شانۆی هەر نەتەوەیەك لە ئەنجامی چەند کردەوەیەکی نواندن‌و چەند تابلۆیەکی شانۆیی‌یەوە بووە •

هەر لە نووسینەکەی زووماندا ، بە درێژی دەوری تەماشاکەرانی سێ قۆناغەکەمان شی‌کردەوە ، وا لێرەدا دەگەڕێینەوە سەریان‌و هەندێك شتی تریان دەخەینە سەر • تەماشاکەرانی قۆناغی یەکەم ، کە لە سیەکان بۆ پەنجاکانن ، ساکارانە ڕوانیویانەتە شانۆگەری‌یەکان ، زۆربەی ئەوانەی دەهاتنە سەیر بۆ خۆدەرخستن‌و مونافەسەی پیاوە ماقووڵەکان بووە ، هی وا هەبووە لە ماڵەوە یان لەسەر ئیشەکەی هەندێك پارەی خستووەتە باخەڵیەوەو لە شانۆکە پێشکەشی تەمسیل چی‌یەکانی کردووە ••• تا بەو کارە گەورەیی‌و بەخشندەیی‌و پیاوەتی خۆی دەربخا ، کەواتە مەبەستی زۆربەی تەماشاکەران کات کوشتن‌و ڕابواردن بووە زیاتر لەوەی شتێ لەسەر زانیاری‌یەکانیان زیاد بکەن •

لێرەدا ، پێویستە دیوێکی تەماشاکەرانی ئەو ماوە دیاری کراوە بخەینە

ڕوو ، تا وەك ناسیاویمان زیاتر بێ لەگەڵ پلەی شانۆگەری‌و ڕادەی تەماشاکەرانی ئەو کاتـە ..... ( ئەمەشـ ) لە زمانی فوئـاد ئەفەنی‌یەوە دەگێڕینەوە ) . .

کات :ــ هاوینی ساڵی ( ١٩٢٥ ) ە .

شوێن :ــ سەر سەکۆکەی ماڵێ ( بەهێ‌خانی شێخ مەحمـوود )ە
که کراوەتە مەکتەب‌و ناوی ( مەکتەبی ئەوەڵ )ە .

ناوی شانۆگەری‌یەکە : ( عیلم‌و جەهل )ە کە لە شانۆگەری ( لولا المحامی ) یەوە کراوە بە کوردی‌و ئامادەکراوە .

بەشداران : کەریمی سەعید بـەگ ( کریـم زانستی ) ، فوئـاد ڕەشید بەکر ، یەحیا ئەفەندی وێنەگر .

( پەردە لادەدرێ‌و شانۆگەری‌یەکە دەست پێ دەکا ... یەکێ لەوانەی هاتوونەتە سەیرکردن جوولەکەیەکی چەتەوڵی عەبابەشانە ، بۆ ئەوەی هەموو خەڵکەکە بزانن ( جولەکەکە ) لەوێ‌یە ، دەست دەکا بە هاتوچۆ بە بەردەم خەڵکەکەدا ، ئەوەندە دێت‌و دەچێ ئاگای لە خۆی نابی‌و دەکەوێتە حەوزی ئاوی بەردەم شانۆکـەوە .. بـە پەلە فریـای دەکەون‌و دەری دەهێننەوە ... بەم ڕووداوەش پێکەنینێکی زۆر دروست دەبێ ... بەهەر حاڵ ، دوای ئەوەی شانۆگەری‌یەکە کۆتایی پێ دێ ، فوئاد ئەفـەنی لە کابرایەکی کاسـبکاری سەیرکەر دەپرسـێ : خاڵـە بەرهەمەکەمانت لا چۆن بوو ؟ کابرا دەمودەس دەداتە قاقای پێکـەنین‌و دەڵێ : بەخوا برا عەنتیکە بوو .. بـە تایبەت ئـەو حەلەی تەمسیل چی‌یەکان کابرای جوولەکە دەخەنە حەوزە ئـاوەکەوە ... ) . ئەمە ڕادەی تەماشاکەرێکی ئەو ماوە کۆنە بووە .

بەڵام تەماشاکەرانی قۆناغی دووەم ( کە لەپەنجاکانەوە تا سەرەتـای حەفتا ) دەگرنەوە ، بەش بەحاڵی خۆیان خزمەتی شانۆکەیان کردووە•• دیارترین هونەرمەندی ئەم ماوەیە ، ڕەفیق چالاکی کۆچ کردووە ، کە توانیویەتی خەڵکێکی زۆر لە شانۆییەکانی کۆبکاتەوە •• تەنانەت پەنای بردووەتە بەر کردەوەی ئەوتۆ کە ئەوەندەی تر شانۆی لای جەماوەرەکە خۆشەویست کردووەو یەکێ لەوانەو لـەو بەرهەمانـەی ( چـالاك ) شانۆگەریی (لەڕێی نیشتماندا)یە کە باربۆکەی پێش کەش بە لێقەوماوانی بوومەلەرزەکەی پێنجوێنی ساڵی ١٩٤٦ کراوە •

هەروەها لەم ماوەی دووەمـەدا ، لایەنێـکی گرنـگی شانـۆ بەرەو پێشەوە چووە ، ئەویش بەشداری کردنی ئافرەتی بە تواناو کارامە بووە لەم بوارەدا ، کە ئەوەندەی تر شانۆگەرییەکانیان پڕ لە ڕوناکی کردووەو بوونەتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی تەماشاکەرانیتر • با لێرەدا بەرێزەوە ، وەك یادکردنەوەیەکی ئەو ئافرەتە هونەرمەندانـە، نـاوی هەندێکیـــان بێنین ، لەوانەی زۆر دەوریان کاریگەر بووە : گوڵزاری عومەر تۆفیق ، نەجاتی شێخ محەمەدی مەحوی ، نەرمینی سەعید ناکام ، بوون •

لە قۆناغی سێهەمدا ، کە لە حەفتاکانەوەو بەرەو ئەمڕۆیە، گۆڕڕانێکی چاك بەسەر ڕادەی هۆشیاری تەماشاکەرانو ڕۆشنبیرییە گشتییەکەیاندا هاتووە ••• هەنـدێ لـەو تەماشاکـەرانە بوونـەتە دۆستی هەمیشەیـی شانۆکەیانو بەسەرنجی ووردەوە لە تواناو کاری پیرۆزی سەر بە میللەتو هونەرمەندە ڕاستگۆکان دەڕوانن •• بەڵام ، وەك ژمارە ، هەر کەمن ، هێشتا نەبوونەتە ئەو تەماشا کەرەی کە تەواوکەری شانۆیە •• بەڵام لەگەڵ بەرەو پێش چوونی بەرهەمەکانو زۆربوونی سەرچاوە ڕۆشنبیرییـــە هونەرییەکاندا ، ئەمانیش لە جیهانێکی نوێدا خۆیان دەبیننەوە •

**بانگ کردنی تەماشاکەر بۆ بینینی شانۆگەری :**

لە پەنجاکاندا ، ڕۆژانی پێش کەش کردنی بەرهەم دەکرا بەچەند ڕۆژێـکی جیا جیاوەو بۆ خەڵکی لەیەك جیاواز ، بۆ نموونە :ـ

شەممە : بۆ خاصەو پیاوماقوڵانو ئەعیان •
یەك شەممە : بۆ ژنانو منداڵەکانیان •
دوو شەممە : بۆ کرێکارانو زەحمەتکێشان •
سێ شەممە : بۆ تەلەبەو ئەو جۆرانە •

لەیەکێك لەو بڕوانامانەی دەستمان کەوتوون ، دیسان جۆری دابەش کردنی تەماشاکەرەو لە ساڵانی ( ١٩٥٧ ـ ١٩٥٨ ) دا بووە ، کە تیپی نواندنی شۆڕشو کۆمەڵی هونەرە جوانەکان ، بەم جۆرە خەڵکیان بانگ کردووە بۆ بینینی شانۆگەرییەکانیان :ـ

«١»ی مانگ : ئەشراف •
«٢»ی مانگ : فەرمانبەران •
«٣»ی مانگ : ژنـان •
«٤»ی مانگ : ئەهالی •
«٥»ی مانگ : قوتابیان •

« هەندێك جاریش ( سەربازان ) ڕۆژێکیان دراوەتێ (٥) • »•

ئەم جۆرە دابەش کردنە تا دوای ساڵەکانی حەفتا بەردەوام بوو ، بەڵام لەدوای ساڵانی حەفتاوە ئەم دابەش کردنە هەڵەیە پێشێل کـراو خەڵکەکە تێکەڵ کران ، بە بێ ئەوەی گوێ بدرێتە جیاوازی ژنو پیاوو ئینتیمای چینایەتییان• لێرەدا با دەوری (تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی)ی سلێمانی لە یاد نەکەین ، کە یەکەم جار دەستپێشکەری خۆیان کردو لە شانۆگەریی ( چەخماخە)ی ساڵی (١٩٧٣)یاندا ، بێ جیاوازی خەڵکیان

لە هۆڵەکەدا داناو هەر ئەم تیپەش ڕۆژی (تایبەتی) لە پرۆگرامی پێش کەش کردنیدا نەهێشتو لەگەڵ کۆمەڵو تیپە نوێیەکانی تردا بارو شێوەیەکی ماقوڵیان بۆ ( عرض ) ەکانیان ڕەخسان •

**تەماشاکەر وەك ژمارە :**

ئەگەر بێنین بە چاوی سەرنجدانەوە ئاوڕێك لە مێژووی بزوتنەوە شانۆییەکانی کوردستان بدەینەوەو سەرنجدانەکەشمان لە سلێمانیدا کۆبکەینەوە ، بۆمان دەردەکەوێ تەماشاکەران بەڕادەی جیاواز ڕوویان کردووەتە شانۆکان •

وا لە خوارەوە ، چەند بەرهەمێکی ئەم دەساڵەی دوایی هەڵدەبژێرین ، کە بە ئاشکرا جیاوازی لە ژمارەی تەماشاکەراندا دەبینرێو هەر بە شێوەی هێڵێکی بەیانی لە بەرزبوونو نزم بوونەوەدایە •••

شانۆگەریی ( سەرینی باداری )یەکەی ئەحمەد دەنگ گەورە لە ساڵی ۱۹٦۹دا ۱۰ ڕۆژ بەردەوام بووەو هۆڵەکەی سانەوی سلێمانییش جێگای ژمارەیەکی زۆر کورسی تێدا بووەتەوە •

( شێتخانە )کەی بورهان مەسرەف لە حەفتادا گەیشتووەتە ۱٤ ڕۆژ پێش کەش کردن •

( ئابلۆقە )ی غازی بامەڕنی لە ۱۹۷٦دا گەیشتووەتە ۱۸ ڕۆژ ، (کووپە)ی فازیل قەساب لە ۱۹۷۸دا (٦) ڕۆژ دەوامی کردو هۆڵەکەشی کورسی چۆڵی تێدابوو •

( ڕەجەبو پیاوخۆران )ی ئەحمەد سالار لە ۱۹۷٥دا (۲۱) ڕۆژی خایاندووەو ( دووڕەگ )ی فازیل جاف لە ساڵی ۱۹۷۹دا (۷) ڕۆژ پیشاندراوە •!•• ئەمانەو نموونەی تریش •

دەتوانین هۆی ئەم جیاوازی‌یەی ژمارەی تەماشاکەران ، لە چەند خاڵێکدا کۆبکەینەوە :ـ

١ـ کاتو ڕۆژگاری پێش‌کەش کردنی بەرهەمەکان ، حوکمی کەمو زۆری تەماشاکەران دەدا •

٢ـ جۆرو زمانی دەقەکەو بیرو ناوەرۆکی بابەتەکە ، لە هاتنی خەڵکیدا دەورێکی گرنگ دەبینێ ، بێ‌گومان دەقی خۆماڵی ، زیاتر لە دەقی بیگانە خەڵکی لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە • ئەمە بێجگە لە بنەماو بنچینە فیکری‌یەکان کە دەقەکەیان لەسەر دامەزراوە •

٣ـ ئەو کەسەی بەرهەمەکە دەردەهێنێ وەزنی لە لای خەڵکی چۆنە •

٤ـ ئەو تیپەی کە بەرهەمەکە نیشان ئەدات چونکە ڕابووردوو و بەرهەمە کۆنەکانی هەر تیپێکو بەشدارەکانی ، لە لای خەڵکی‌و تەماشاکەران ناسراوەو شایەتی‌ی بۆ دەدەن •

٥ـ نەبوونی قوتابی‌و ئافرەت لە هەموو بەرهەمێکدا کۆسپێکی گەورەیە• قوتابی بە هۆی دەرس‌و کۆششی قوتابخانەیەوە ، ئافرەتیش بە هۆی ئەو کۆتەی کە بارە کۆمەلایەتی‌یەکە لە مەچەکی ناوە •

٦ـ شێوەی ڕاگەیاندن‌و جۆری پۆستەرو گەیاندنی هەواڵی بەرهەمەکە لە لایەن ئێسگەو تەلەفزیۆنەوە •

٧ـ ئەو هەواڵو ڕێپورتاژانەی ، ڕۆژنامەنووس‌و نووسەران بەر لە پێش‌کەش‌کردنی شانۆگەری‌یەکە لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان بڵاوی‌دەکەنەوە •

× × ×

**بایەخی تەماشاکەری شانۆ :**

پێویستە ئەو ڕاستی‌یە بزانین کە بەبێ بـوونی تەماشـاکەری بابەتـە هونەری‌یەکان ، هیچ ئەنجامێك دەستگیر نابێ‌و پێویستی بە بوون‌و بەردەوامی جوڵانەوە شانۆییەکەش ناکا . ( نبیل بدران ) ی نووسـەر لـە بارەی دەوری تەماشـاکەری شـانۆو گرنگی ئەو تـەماشـاکەرانـە وە لە هۆڵی شانۆکەدا دەڵێ :ــ

( ئایا دەتوانین شانۆیەکی بێ تەماشاکەر دابنێین بە شانۆی تەواو ؟ بێ‌گومان نەخێر چونکە شتێکی سروشتی‌یە ، شانۆ خـۆی لە خۆیـدا هونەرێکی جەماوەری‌یەو بوونی لەگەڵ بوونی خەڵکەکەدا دەسەپێنێ ، بە کزبوون‌و نەمانی تەماشاکەران ، شانۆ بەرەو کزی‌و دۆزەخی نەمان‌و لە بیرچوونەوە دەڕوا ... مەرامی شانۆ ، پارە پەیداکردن‌و سـوودە ماددی‌یەکە نی‌یە ، بەڵکو لە پێناوی ئامانجێکی مەعنەوی‌دایە ، شانۆ هەوڵی تێگەیاندن‌و جوانکردنی میزاجی خەڵکەکە دەدا ... دەیەوێ بەشدارێکە کارێگەر بێ لـە درووسـتکـردنی جیهانێکی باشـتردا کـە هەمـوو خواستەکانی ئادەمیزاد بێنێتەدی‌و خەوە سـەوزەکانی مرۆڤایـەتیی مـەزن بگەیێنێتە واقیعێکی قەشەنگ‌و بەنرخ‌و ڕازاوە ) (٦) ...

ئەو نووسـەرە زیاتر لە دەوری تەماشـاکەران دەکۆڵێتـەوەو لە ئەنجامی بەراوردکردنیاندا لەگەڵ تەماشاکەرانی فلیمـە سینەمایی‌یەکانـدا دەڵێ :ــ « ئەگەر لە یەکێ لە هۆڵەکانی سینەمادا ، تەماشاکەرانی فلیمێك تەنها پێنج کەس بن ، ئەوا هیچ لە مەسەلەکـە ناگۆڕێ‌و فلیمـەکە وەك خۆی بە چاکی دەڕواو هیچ کارێك‌و ڕەنگدانەوەیەکیشـی لە ئەکتـەرە سەرەکی‌یەکانی ئەو فلیمەدا نابینرێتەوە ... بەڵام ، ئەگەر تەنها پێنـج کەس میوانی شانۆیەك بن ، بێ‌گومان ئەکتەرەکان هەسـت بـە چـۆڵی

هۆڵەکە دەکەن‌و ئەنجامی ئەو هەست پێ‌کردنەشیان لە دەورەکانیاندا دەبینرێتەوەو مافی هیچ جۆرە گلەیی‌یەکیشمان بەسەریانەوە نابێ ...
چونکە ئەکتەری شانۆ بەرامبەر بە کۆمەڵێ کورسی چۆڵ توانای داهێنان‌و سەرکەوتن‌و نواندنی چاکی نامێنێ چۆنکە بوونی خۆی لەگەڵ بوونی تەماشاکەرەکاندا دەبینێتەوە ) (۷) ...

ئەمڕۆش ، کە ڕێبازو شێوەی کارکردنی بەرهەمە شانۆیی‌یەکان لە قۆناغێکی نوێ‌دا خۆی دەبینێتەوە ، دەبێ ئاگاداری ئەو ڕاستی‌یە بین کە دەڵێ :ـ شانۆ ووتوویژێکە لەگەڵ خەڵکیدا » ، ئەوەش فەرامۆش نەکرێ کە گەلێ دەرهێنانی نوێ ڕێ بە تەماشاکەران دەدا کە ئەگەر لە جیگەیەکدا دامان ، یان پرسیارێك خۆی سەپاند بەسەریاندا ، لە ئەکتەرەکان بپرسن‌و ئاسایی‌یە موناقەشەی گەرم‌و گوڕیش درووست ببێ لە نێوانیاندا . دیسانەوە بۆ ئەکتەریش هەر هەمان شێوەیە ، گەر شتێ پێویستی بە پرسیار کردن کرد ، ئەوا دەتوانێ دەرگای موناقەشە لە تەماشاکەرەکان بخاتە سەر پشت‌و لەگەڵیاندا بدوێ ...

بەڵام ، ئەوەی یەکجار جێی بایەخ پێ دانە ئەوەیە کە تەماشاکەری ئاسایی لەگەڵ تەماشاکەری ڕاستەقینەدا تێکەڵ نەکرین ، چونکە ئەگەر تەنها مەبەست لە سەیرکردن‌و کات، کوشتن بێ ، ئەوا لە نرخی شانۆو گرنگی تەماشاکەرانی کەم دەبێتەوە ، بەڵام بە بوونی تەماشاکەری هوشیارو کارامە ، بەرهەمی چاك‌و سەرکەوتوو لە کارە هونەری‌یەکەدا دێتە دی .

یەکخستنی بیرکردنەوەو نزیك بوونەوەی شانۆکارەکانی کورد لەگەڵ ئەو جۆرەی تەماشاکەرە هوشیارەکان ، مژدەی دانانی پرۆگرامێکی گەشبین‌و ڕوناك‌و جوان دەدەن بە مێژووو کاروانە پڕ لە هیواکەی گەلی کورد ...

**داوای ئەمڕۆ لە هونەرمەندەکانی شانۆ :**

ئەو کاتەی کۆمەڵێك دەیانەوێ بەرهەمێکی شانۆیی پێش کەش بکەن ، گەلێك پێویستە ئەو « ڕاستی » یە بزانن کە دەڵێ :ـ ( هونەر تەنها دەربڕینی ژیان نی‌یە ، بەڵکو لی‌زیادکردن‌و پێش‌خستنیشیێتی ) (٨)..

د. محەممەد مەندور لە کتێبەکەیدا دەڵێ :ـ «ئیشی گرنگی ئەدیب‌و هونەرمەند تەنها ئەوە نی‌یە کێشەو گیروگرفتەکانی سەردەمەکەی خۆی بە هەموو ژانەکانیەوە هەست پێ بکاو دەری ببڕێ بۆ خەڵکی ، بەڵکو دەبێ لەسەر قەناعەت‌و ڕای خۆی پێ داگرێ‌و بینینەوەی جیهان لە چاوی خۆیەوە بۆ خەڵکەکە شی بکاتەوەو لێپرسراویش بێ بەرامبەر بەو ڕایانەی دەریان دەبڕێ ، ئەگەر لەسەر قەناعەت‌و ڕاکەی تووشی گێچەڵ‌و مەینەتیش بێ » (٩) ...

ئەرکی یەکەمی سەر شانی هونەرمەندیش، چاندنی عەشقێکی پیرۆزە بەرامبەر بە خاك‌و گەل‌و هونەرەکەی ..خۆپەرستی‌و خۆ بە گەورەزانین‌و فەرزی هەڵوێستی چەوت ، تواندنەوەی مەرامی شەخسی‌و خوار ڕۆیین، لە نرخی بەرهەمی دادەبڕێ‌و بەرەو نەمانی دەبا ، لێرەدا با لەگەڵ ووتە بەناوبانگەکەی « ستانسلافسکی » دا دەنگمان یەکخەین کە دەڵێ :ـ « خۆتان لە هونەرەکەتاندا خۆش نەوێ ، بەڵکو هونەرەکەتان لە خۆتاندا خۆش بوێ » .

لە پاش حەفتاکانەوە ، هەر وەك زووتریش ووتمان ، خەڵکەکە دوای بانگەوازی هونەرمەندەکان کەوتوون ، ئەمڕۆش کە ڕۆشنبیری‌ی هونەری لە ناو خەڵکیدا بەرفراوانترەو ئەو سەرچاوانەی کە هونەرمەند ئیشی تێ‌یان دەکەوێ ، بە ئاسانی چنگی تەماشاکەریش دەکەون، لەبەر ئەوە ئەمیش خواستی خۆی هەیە ... کاتێ بەرهەمێ نیشاندەدرێ هەر

یەکێ لە تەماشاکەران ڕای خۆی دەردەبڕێ ، دوورو نزیکی ئەو بەرهەمە لە واقیعی کوردەواری خۆمانەوە دەپێوێ ، لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکانیش دەبینی گەلێ جار ڕای ئەوتۆ دەربڕاوە کە مایەی گەشبینیو خۆشحالین ••• ئەوەتا لە سالی ١٩٧١ دا ع• ع• م• ناوێك لە هاوکاریدا بەوپەڕی ڕێزەوە لە « جەنابی موفەتیش » دەدوێو دەلێ :ـ « مامۆستا رؤوف حسن شانۆییەکی جوانو گونجاوی هەلبژاردووە کە پێویست بوو بۆ ئەم ڕۆژگارە » (١٠) ••

بە گوێرەی بەرەو پێشەوە چوونی بەرهەمەکانیش تەماشاکەران گۆڕانیان بەسەر خۆیاندا هێناوەو چەند بۆچوونێکی ماقوول هاتووەتە کۆڕی نووسینو موناقەشەوە ••• فەهمی قەرەداغی ، دیسانەوە لە هاوکاریدا سەبارەت بە شانۆگەری « ڕەجەبو پیاوخۆران » نووسیویە دەلێ :ـ ( لە ڕەجەبو پیاوخۆراندا ، پیاوخۆرەکان کە ڕەجەب دەکوژن ترسی گەورەیان لە « مەهدی » یە ، چونکە شانو مل ڕووتە ، کرێکارە، کوڕی ڕەجەبە ، بیر ڕوناکەو کتێب ئەخوێنێتەوە •• گەرچی لەوێدا شانۆگەرییەکە تەواو ئەبێ بەلام لە ڕاستیدا لەوێوە دەستی پێ ئەکات ) (١١) •••

هەموو مرۆڤێکی دلسۆز بە گەل ، حەز بە پەرەسەندنو جوانکردنی هونەرەکەی دەکا •• حەز بە بەرەو ڕەسەنی بردنی شانۆکەی دەکا ••• ئەرکی یەکەمینی هونەرمەندانی شانۆشمان لە بە بەرداکردنی بەرگێکی کوردیی ڕازاوەدایە بۆ بەرهەمەکانیان •• شانۆی هەر نەتەوەیەك گەر مادەی خۆی نەبنە بناغە ، ئەوا شتێکە حەتمییە بەرەو لاوازیو گیانەلا دەچێ •• ئەمڕۆ پێویستمان بە دەقی کوردییە ، بەلام ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ کە بە تەواوی واز لە هەموو ئەدەبیاتی بێگانە بهێنین ، چونکە

سەدان شاکارو درامای ئەوتۆیان تێدایە ، کە پێش کەش کردنیان بۆ زۆربەی گەلان پێویستو ڕەوایە ...

هەر لەم بارەیەوە ، مامۆستا « ئەحمەد سەلار » لە وەڵامی پرسیارێکدا دەڵێ :ـ « جەماوەری کورد ئەیەوێ شانۆییەکانی بەگیانی نزیك بێتو خۆی تیا بدۆزێتەوەو خۆی تیا بناسێتەوە ، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بووە زۆر جار شانۆی بێگانە ڕوویەکی کوردی دراوەتێ ، ئەوەندەش هەیە کە هەموو میللەتێك ئاوڕی داوەتەوە لە شانۆی بێگانە .. بەڵگەش بۆ ئەمە چەند نووسەرێکە کە بوونەتە خەڵکی هەموو وولاتێك . وەك : شەکسپیر ، مۆلێر ، چێخەف ، گۆرکی . نووسەرە شانۆییەکانمان بە پەنجەی دەست دەژمێررێن ، هەرچەندە سوپایەك نووسەرمان هەیە . ئەوەندەش هەیە نزیك ترین ئەدەبو هونەر بۆ ژیان شانۆیە ، چونکە ڕاستەوخۆ بە جەرگەی واقیعەوە نووساوە ، ئەگەر بمانەوێ دەنگمان بە خەڵکی وولات بگات ) (١٢) ...

لە کۆتاییدا ، داوای لێبوردن لە کەمو کوڕییەکانی ئەم باسە دەکەم با ئەوەشی بۆ حیساب کرێ ، کە یەکەم نووسینە لەو بوارە بەنرخو گرنگەی شانۆدا ، بەهیوام نووسینیتری بەدوادا بێو وەك ئەرکی سەرشانمان خزمەتێکی هونەری گەلەکەمانی پێ بکەین .

---

(١) پاشکۆی (عێراق) ـ ژمارە (٧) ـ ١٩٧٨ ـ بینەر لە شانۆی کوردیماندا ـ ئەکتەرێکیی کورد .

(٢) ئەم نووسینە بەشێکە لە باسێکی فراوان کە لە کۆڕێکی ( بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەری سلێمانی)داو لە ڕۆژی ١١ـ٥ـ١٩٨٠ دا لە

لایەن نووسەرەوە بە بۆنەی ئاهەنگەکانی ڕۆژی شانۆی جیهانی‌یەوە پێشکەش کرا •

(٣) المسرح العراقی الیوم ـ ص ٣ ـ المؤسسة العامة للسینما والمسرح ـ بغداد ـ ١٩٧٨ •

(٤) حەسەن تەنیا ـ مێژووی شانۆی کوردەواری ـ ل ١٠ ـ کتێبێکی دەستنووسە ئامادەیە بۆ چاپ •

(٥) لە پەیداکردنی ئەو بڕوانامەیانەدا سوودم لە مامۆستا کاوە ئەحمەد میرزا وەرگرتووە •

(٦) مجلة ( افاق عربیة ) عدد ٨ ـ السنة الخامسة ـ نیسان ١٩٨٠ ـ ص ١٢٦ •

(٧) هەمان سەرچاوە •

(٨) عبدالعزیز حمودة ـ علم الجمال والنقد الحدیث ـ ص ١٧ •

(٩) الدکتور محمد مندور ـ في الادب والنقد ـ ص ١١ •

(١٠) ڕۆژنامەی ( هاوکاری ) ژمارە ٢٩ ـ ساڵی ١٩٧١ •

(١١) ڕۆژنامەی ( هاوکاری ) ژمارە ٢٨٠ ساڵی ١٩٧٥ •

(١٢) ڕۆژنامەی ( برایەتی ) ژمارە ٧٨ ساڵی ١٩٧٣ •

× × ×

کردووە ، کە وێنەی ئەو کێشەیە لای خانی تەواو جیاوازە ـ خانی هەموو هەژارو چەوساوەو لێشاوی جەماوەری لەشایی ستیو تاژدینەدا کردووە بە نوینەرو نموونە • بەڵام کاکی نووسەر هەندێ قسەی لە لای ترەوە هێناوەو داویێتە پاڵ مەموزین ( بڕوانە لاپەڕە ٢٦ ی ژمارەکە ) و کردوویەتی بە بناغەی لێکدانەوە •

ئەنجام : ئەم باسی چینایەتی یە زۆری پێوە نراوەو وا بزانم نووسەر تاقە کەسە ، ( مەموزین) ی بە ( زمان خانی یەوە ) کردبێت بە کوڕو کچی دوو چینی جیاواز • هێشتا کەس ئەمەی نەووتبوو هاوارو فیغانی کۆنەپەرست هەستا ، دەبێ ئێستا چی بڵێن ، جارێکی تر هەموو شت بە خوێ ، خوێش بە مەعنا •

هەوڵدانی تری نووسەر جێی سوپاسەو ( هیوا ) ی بەرهەمی فراوانترو بە پیت ترو سەرکەوتنیمە •

**بەرپەچ دانەوە :**

نازانم زۆر لەو ووتارانەی لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی یەکاندا بڵاودەکرێنەوەو دەچنە خانەی ڕەخنەگری یەوە ناو دەنرین چی ؟ •

دەبینین ، زەمین ببرێتە ئاسمانو ئاسمان ببرێتە ژێر خاك ، کلك لە جێی سەرو سەر لە جێی کلك دانرێ نووسەر بێدەنگە • بەڵام هەر لەکونجێکی دوورەوە شتێك ، ووتەیەك ، ڕەخنەیەك ئەو بگرێتەوە ، بەجواب دێتو جۆرە لە یەکتر دووانێك دێتەکایەوە ، کە زۆرتر شەخسی نووسەر دەگرێتەوەو ناچێتە سەر باسو لەهەموو ( شەڕەدەنووك ) ەکەدا زۆر کەمی تێدا دەمێنێتەوە کە سوودی گشتی ی تێدا بێتو خوێنەر سوودو چێژی لێ وەرگرێت • هەر زۆر بەدەگمەنیش ڕێدەکەوێ ئەو

نووسەرانەی لەسەریەك دەنووسن ، پێوەندیی باشیان لەنێواندا هەبێ ، یا هیچ نەبێ نووسینەکە نێوان تێکچوونی لەدووا نەبێت •

ڕەنگەلێرەدا بتوانم هەقی ئەم قسانە بدەم بە خۆم ، چونکە تائێستا ڕەواو ناڕەوا چیم لەسەر نووسرابێت پێی قەڵس نەبووم ، کاری نەکردۆتە سەرپێوەندیی منو ڕەخنەنووس ، ئەوەتا نموونەش زۆرەو زۆر جار لە جێی چاك نووسین جنێوم بیستووەو هەڵوێستی بەرامبەر بە نووسینو نووسەر نەگۆڕیووم • هەر لەم هەڵوێستەوە دەمانویست « نووسەری کورد » لەو بابەتە ڕەخنەو شەڕە دەنووکانە بە دووربگرین • بەلام هەر تێوە گلاین • لێرەشدا نامەوێ لە هیچ لەو ووتارانەی ژمارەی پێشووو پێشووتر بدوێم ، تا منیش لەکونجێکەوە نەچمە ناو ئەو گێژاوەوەو نامەوی نموونەش بێنمەوە • بەلام ئەوەندە دەڵێم ـ لەم ژمارەیەوە ، هەرچی پێوەندیی بە ( شەخس )ی نووسەرەوە بێت ، یا دڵی کرمێ بکات، یا ناکۆکی بخاتە ناو دوو نووسەرەوە ئێمە خۆمانی لێ دوور دەخەینەوەو لاپەڕەی نووسەری کورد بۆ هەموو نووسەرانی سەر بە گەلو پێشکەوتنەو تەماشای ئاسۆی فراوانی ئەمڕۆو سبەینێ دەکات • هەرچی ڕەخنەی ڕاستەقینەشە ، ئەوە سنگی بۆ دەکەینەوە • ئەگەر نووسەرێکیش دڵی خۆیوا ناسك بکات کەڕێگەی رەخنەی ڕاستەقینەی بۆ بگرین ، وا بزانم کەس هەقی ناداتێ • یا یەکێك بیەوێ گەلو سامانو خوڵقاندنو ڕابوردوومان بەدناو بکات ، بتوانێ لەزۆر شوێندا نووسەرانی بۆ دەمکوت بکرێن ، ڕەنگە ئەو دەسەلاتەی نەگاتە لای ئێمە •

برایانی شاعیرو نووسەر : ئەرکی زۆرمان لەسەرە • با دڵپاك بین ، لە ریزی کاروانی گەلو پێشکەوتندا یەك بینو بۆ گەلو ئاسۆو گەشەو جوانیو سەرکەوتن بنووسین •

# ماڵئـاوایی سێ نووسەر

## ( ١ )

بە هێمنی ژیاو زۆر بە هێمنی کۆچی دوایی کرد •

ڕۆژی ١٩٨٢/٥/٢٦ بوو ، شێخ مارفی قەرەداخی بـەپێی خـۆی چووە بـەردەمی نەخۆشـخانەیەك ، بەڵـکـو هـەندێك لە ئـازاری ئـەو نەخۆشییەی کەمبکرێتەوە کە دەمێك ساڵ بوو ئازاریدەدا ، بەڵام بەر لە ڕۆیشتنە لای پزیشك ماڵئـاوایی لەو جیهانـە کرد کە هیـچ ئاواتو هیوایەکی تێدا نەهاتبووەدی •

ئەوانەی لە نزیکەوە ئەم نووسەرە دڵسۆزە دەناسن ، دەزانن چۆن دڵی لەگەڵ هەموو ئاواتو ئازارەکانی گەلو نیشتماندا لێیدەدا ، دەزانن چەند بەقووڵیو فراوانی گەلو نیشتمانی خۆشدەویست •

چەنـد لە کاری پێژیانەکەیدا ، لە سەعاتچێتییەکەیـدا ووردو هونەرمەند بوو ، هەر بەو ووردییەشـ دەیویسـت ووشـەی کوردی بچنێ • لە مەیدانی مێژوودا بە وەرگێڕان • لە مەیدانی زماندا بە دوو بەرگی فەرهەنگی •• « کشـتوکاڵ » و بـە گەلێـك ووتارەوە هاتـە مەیدانی نووسەرانەوەو هێشتا گەلێك بەرهەمی چاپنەکراویشـی ماوە •

خاڵە شـێخ مارف ، حەفتا سـاڵێکی لەگەڵ ژیانـدا بردەسـەرو بەجێیهێشـتین • بـەڵام ناوی ، کاری مەردانـەی ، یـادی هـەر لە دڵماندایـە •

له دەمەو ئێوارەی ڕۆژی سێشەممە ١٩٨٢/٦/١ دا بـۆ دواجـار مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەری نووسەرو ڕۆشـنبیرو دلسـۆزی کـورد۔ ماڵئاوایی لێ کردین •

مامۆستا جەوهەر لە ساڵی ١٩٢٠ دا لە یەکێك لە گوندەکانی ناوچەی قەرەداغ هاتە دنیاوە •••

هەر لە کۆتایی سییەکانەوەو بەدرێژایی ساڵانی چل •• بەرهەمە ئەدەبییەکانی لە گۆڤاری گەلاوێژو ڕۆژنامەی ژیاندا بە ناوی خۆیەوەو هەروەها بە ناوی ع چالاكو ( ج ) ەوە بڵاودەکردەوە •

لە ساڵی ١٩٣٧ دا کە لە پۆلی دووی ناوەندی بوو بۆ یەکـەمجار کتێبێکی بە ناوی « ئاوات » ەوە دەرکرد ، هێشـتا کتێبەکە لە چاپخانـەی ژیان نەهاتبووە دەرەوە ، کە کاربەدەستانی ئەو سەردەمە قەدەغەیان کردو نەیان هێشت بڵاوببێتەوە •• هەروەك لەسەر بەرگی کتێبەکە نووسراوە•• نیازیوابوو بەردەوام بێ لەسەر بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیو بەرەبەرە ئاواتەکانی نێو دڵی بخاتە بەردەستی خوێنەرانی کورد ••

مامۆسـتا جەوهـەر لە سـاڵی ١٩٦٥ دا زیاتـر لە ( ٣٠٠٠ ) کتێبی کوردیو عـەرەبیو فارسـیو ئینگلیزی بە کتێبخانـەی گشتی سـلێمانی بەخشـی ••

ئێستاکەش کتێبخانـە تایبـەتییەکەی خۆی هـەتا بڵێی فـراوانو ئاوەدانـە ••

ماموٚستا جەوهەر سەرەڕای ئــەمانە خوێنــەوارێکی پشــوو درێژو بێدەنگ‌و هێمن بوو •• چ بە زمانی کوردی‌و چ بە فارســی‌و عەرەبی‌و ئینگلیزی لەسەر خوێندنەوە بەردەوام بوو • ئێمە پرسەی خوٚمان بە بنەماڵەی ماموٚستای کوٚچ‌کردوو ڕائەگەیەنین‌و بەهیواین ئەو بنەماڵەیە بەتەنــگ بەرهەمە دەستنووســەکان‌و کتێبخانــەکەی ماموٚســتاوە بێن‌و لە فــەوتان بیپارێزن •• تاکو دەرفەتی ئەوە دەبێت کە لە دواڕوٚژدا دەســخەتەکانی ماموٚستا بە چاپ بگەیەنرێت •

## - ٣ -

دوا فوٚرمەی گوٚڤارەکەمان ئامادەی خستنە ناو مەکینــەی چاپ ئەکرا کە لە ١٦/٦/١٩٨٢دا دڵی ماموٚستا حاجی ســادق بەهائەدینیش لە لێــدان کەوت •

ماموٚستا سادق کە لەپاش شوٚڕشی ١٤ ی تەمووزەوە هاتووەتە مەیدانی ڕوٚشنبیری کورد ، بەدرێژایی ئەم ماوەیە بەگوێرەی توانا لە مەیدانا بووەو تا دەرفەت بوو بێ لە رادیوٚو گوٚڤارو روٚژنامەو چاپەمەنی کوردیدا شوێن دەستی دیار بووەو ، بەتایبەتی خــوٚی بوٚ ئەدەبیــاتی کرمانجی ســەروو تەرخان کردبوو •

ماموٚستا سادق لە ئەندامە لەمێژەکانی یەکێتیەکەمان بوو • لە کوٚنگرەی چوارەمیشدا بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر هەڵبژێررا •

کوٚچی دوایی ماموٚستا سادق بەسەر دڵی هــەموانەوە گرانــەو ، ئێمەیش پرسەی خوٚمان پێشکەش بە پاشماوەو کەس‌وکارەکانی ئەکەین•

# به یادی مامۆستا بەشیر

ئەم چەند دێڕەمان لە ( ئیحسان فوئاد ) ناوێکەوە بۆ هاتووە • هەر لەسەرە مەقەستە قەدیمەکانی « گەلاوێژ » و « شەفەق » ی مامۆستا بەشیر خۆی دەچێ •

بەشیر گیان : تووڕە مەبە ، گۆڕ هەڵمەتەکێنە ، کە بە خەتی ( مارف ) بڵاوی دەکەینەوە • بەشکم ئەمە سەرەتای ئاشتبوونەوەتان بێت •

لەگەڵ یەکتر درن چەشنی هەڵۆ
یەک دا دەڕاچن بۆ ؟

لە بۆ غەیرە شڕن چەشنی پەڕۆ
وەک دەستەوقاچن بۆ ؟

هەزارتیرەو لەک و هۆزن وەکو
دوژمن لە یەک ناچن ؟

ئەترسم ڕۆژێ لەم خاکە هەموو
تیا چن وەکو سمکۆ ؟

بەشیر موشیر
٢٧ شوبات ١٩٨١

# پێڕست

**سەرنووسەر : ـ**

ئەم ژمارەیەش ٣

**ئەحمەد عەبدوللا زەروو : ـ**

پێداچوونەك لسەر مامكێت كوردی ٧

**دوكتۆر وریا عومەر ئەمین :ـ**

فۆنیمەكانی زمانی كوردی ٢٩

**رەئووفی ئەحمەد ئالانی**

دیاردەیەكی زمانەوانی ٣٦

**شێركۆ بێكەس :ـ**

بەیتی ئاگر ٤٣

**عبدالرحمن مزوری :ـ**

بەیتا كەوا ٦٨

**حەمەسەعید حەسەن : ـ**

چوار پارچە شیعر ٧٠

**مۆیەد طەیب :ـ**

ستران‌و بەفرو ئاگر ٧٥

**مارف عومەر گول**

خۆرەتاو ٨١

**جەمال غەمبـار :ـ**
خۆ تۆ خەم نیت ٨٣

**ف. ن. نیزفال ( و : محمود زامدار ) :**
پـراگ ٨٧

**موسی النقدی ( و : عەزیز حەریری ) :**
لوبنـان ناکەوێ ٩٤

**د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ :ـ**
پێدا چوونەوەو سەرنجێك ٩٦

**ئەمینی میرزا کەریم :ـ**
کە دەزووڵە خوێنەکان ئەچۆڕانەوە ١٠٤

**محەمەد فەریق حەسەن :ـ**
تارماییـەکان ١١١

**زاهیر ئەحمەد سەوز :**
ئەو لە بازنەیەکی داخراودا ١٢٠

**سەلام مەنمی :ـ**
سەفـەربەر ١٢٦

**م . ع . م . :ـ**
منو هەر چوارمان ١٢٩

**زەریا :ـ**

دیمەنێکی یادداشتی چەند ساڵە ١٤٣

**بوواری عەجنیە ( و : نەژاد سورمێ ) :ـ**

ژانو سۆزی گەورە ١٤٨

**عەزیز نەسین ( و : محەمەد حەسەن ڕۆژبەیانی ) :**

یادداشتی هونەرمەندێك ١٥٤

**مستەفا سالح کەریم :ـ**

بەڵگەیەکی تری دیداری چیرۆکی کوردی ١٦٦

**عبدالرزاق بیمار :ـ**

مەڵێ باپیر ١٧٢

**جمال محمد اسماعیل :ـ**

زیندە خـەو ١٧٦

**عبدالله عباس :ـ**

عەودالی چیت ؟ ١٧٩

**یاسین قادر بەرزنجی :**

تەماشاکەر لە شانۆی کوردیدا ١٨١

ماڵئاوایی سێ نووسەر ١٩٦

# ئاگاداری

قەسیدەی ( بەیتی ئاگر ) کە لە لاپەڕە ( ٤٣ - ٦٧ )ی
ئەم ژمارەیەدایە ، نووسینی شاعیرمان شیرکۆ بێکەسە •

× × ×

پاشماوەی وتاری ( پێداچوونەوەو ••• سەرنجێك ) ی دوکتۆر
عیزەدین مستەفا لە لاپەڕە ( ١٩٤ - ١٩٥ ) دایە •